# بەسەرهاتەکان و پەیوەندییان بە ئایینەوە



ئامادەکردنی : خدیجە عمر

ناوی کتێب: بەسەرهاتەکان و پەیوەندیان بە ئاینەوە
بابەت  ئاینی
دانان و نوسین: خدیجە عمر محمدامین
کۆمپیوتەرو دیزاینی بەرگ: توانا ولی
ساڵی چاپ: ٢٠١٠
لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٩١١) ی ساڵی ٢٠١٠ پێ دراوە
تیراژ : (١٠٠٠) دانە

شوێنی چاپ کردن: چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر

# ( پێشەكی )

(بسم الله الرحمن الرحیم)

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَـٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ صدق الله العظیم ﴿الكهف﴾

واتا{سوپاس وستایش بۆئەو خوایەی کە قورئانی بۆسەر بەندەی خۆی (محمد.د.خ) رەوانە کردووە، بەڕاستی هیچ کەم وکوڕی وناتەواویەکیشی تیادا بەدی ناکرێت)( کتێبێکی بەنرخ وپایەدارە تا(یاخیەکان)لەسزایەکی سەخت بێدار بکاتەوە کەلەلایەن خواوە(لەدنیا وقیامەتدا)یەخەیان پێ دەگرێ. وەموژدەش دەدات بەو ئیماندارانەی کە کارو کردەوەی چاك ئەنجام دەدەن بەوەی کەپاداشتی زۆر چاك بۆیان ئامادەیە﴾(تەفسیری ئاسان)

<u>برای بەڕێزم .خوشکی ئازیزم</u>

دووشتی گرنگ هەیە کەپێی نازانین تالەدەستی دەدەین . یەکەم_کاتە.دووەم_ گەنجیە! دەڵێن کات وەك شمشێرە گەر نەیبڕی ئەتبڕێ، بۆیە دەبێ ئاگاداری کاتەکانبین بەفیڕۆیان نەدەین.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ صدق الله العظيم ﴿ الكهف ﴾

واتا {هەرگیز دەربارەی هیچ شتێك وهیچ کارێك مەڵێ من بەیانی وادەکەم وئەوکارە دەکەم}ت.ئاسان ئەوە هی تۆیە کەلەژێردەستت دایە،ئەوە هی تۆنیە کەبڵێی دوێنی وام کردیان بەیانی وادەکەم تەمەن وگەنجیەتییش وایە ئەمڕۆ خاوەن روحێك وجەستەو دڵ ودەرونیکی خاوەن بیروو ڕایەکی خاوەن ئەمانەتێکی خوایی ئەویش خۆتی ئەی ئادەمیزاد هەر وەك شاعیردەڵێ (الالیت شباب یعود یوما حتی احکی له ماذا فعلت فی مشیبی) ڕۆژێك دێت کەپیر دەبیت دەڵێ خۆزگە ڕۆژێك گەنجیەتیم بۆدەگەڕایەوە تاکوپێم گووتبا چیم کرد لە تەمەنی پیری. بەلاَم ئەوە تەنها خۆزگەیەکە (ابکی علی یومیك لاتبکی علی مافاتك) بگری بۆ ئەوڕۆژەی تیایدای مەگری بۆئەوڕۆژەی لەکیست چوو مەگری بۆئەو ڕۆژەی بەجێی هێشتی وپشتێ لێکردی. مرۆڤی ئاقڵ وژیر لە ڕابردوو دەرس وەردەگرێت بۆداهاتووی . بزانن ئازیزانم ئەم پەرتوکەی لە ژێردەستتان دایەبۆ ئێوەی ئازیزە .بۆئەوەی کاتێکی بە سودوو بەخشندەی لەگەڵدا بەسەربەرن .تابتوانین لەکاتەکانی دەس بەتاڵی وفەراغەت سود وەرگرین (من بەندەی خودا زیاتر لەدەساڵە هەوڵ بۆئەوە دەدەم ئەم پەرتوکە تەواوبکەم بیخەمە ژێردەستی ئازیزانم کەئێوەی بەڕێزن. بەکۆکردنەوەی بەسەرهاتەکان وڕوداوەکان کاتێکی زۆرم تەرخان کرد بۆئەوەی بتوانم بەسەرهاتی ڕاستەقینە بخەمە ڕوو. بەهیوای ئەوەی ڕونکردنەوەیەك دەربارەی ژیانی مرۆڤ بەکردەوەی چاکی وکردەوەی خراپی ئاشنابین وبزانین. لەخوادەپاڕێمەوە خراپەکانمان بەچاکە بۆبگۆڕی،ئێوەی ئازیزیش چەند پەندێك وئامۆژگاریەکی لێوەرگرن، هەوڵی چەندساڵەم نەبێتە خوێندنەوەیەکی بێ ئاکام ،انشاالله)

چەند بەسەرهاتێکی راستەقینەی تێدایە کەوا ڕۆژانە چاومان پێیان دەکەوێ وگوێ بیستیان دەبین .زۆر لایەنی گرتۆتەوە وەك کۆمەڵایەتی و سۆزداری و ئیمان وباوەڕ وتەبایی و ڕێزگرتن وشکستی ونەهامەتی ژیان ،بەهیوای سود وەرگرتن.

وە زۆر سوپاسی ئەو دایك و باوك و خوشك و برایانە دەکەم کەوا دەی خوێننەوە .

وە داوادەکەم لەم ئازیزانە کەناویان هاتووە یان بەسەرهاتەکانیان نوسراوە دڵیان لێمان نەڕەنجێ چونکە تەنیابۆ ڕونکردنەوە یەو بۆ تێگەیشتنە لە ئازارەکان و خەمەکانی ژیان. تا بۆهەموومان ئاشکرابێ و بزانین ژیان خۆشی و ناخۆشی تێدایەوە بەتێگەیشتن و دڵ گەورەیی وتەبایی وخۆشەویستی ودڵ سۆزی زۆرکێشە هەیە هەرچەند گەورەبێ دەتوانین چارەسەری بکەین.

(خوداپشتیوان ویاربێ)



## بابەتی (یەکەم)

# ڕێزلێنانی باوك ودایك

## (احترام الاب والام)

بەڕێزان ئاگاداری دایك وباوكتان بن.ئەگەر تائێستا كاتت لەبەردەست ماوە هەلێكە بۆت تاكو پاداشتی هەندێك لەچاكەكانیان بدەیتەوە:

ئەبوهورەیرە.ڕەزای خـوای لەسـەر: دەڵـێ: پێغەمبـەر درودی خـوای لێبێـت: فەرمویـەتی (سەرشـۆڕبێت، سەرشـۆڕبێت، پاشـان سەرشـۆڕبێت، پاشـان سەرشۆڕبێت،) عەرزیان كرد كێ ئەی پێغەمبەری خوا.ص،؟ فەرمووی:كەسێك گەیشتبێت بەباوك ودایكی یان بەیەكێكیان لەكاتی پیریدا وپاشان نەچووبێتە بەهەشتەوە،واتە چاك نەبوبێت لەگەڵیاندا:.ﷺ.صحيحي مسلم

دڵیان مەشكێنن چونكەكاتیك بەناوساڵ دەكەون دڵیان وەك منداڵ لێدیتەوە. هەستیان ناسك دەبێت كاتی وا هەیە خۆت لەمنداڵەكەت توڕە دەكەیت وادەزانن لەگەڵ ئەوانتە یان كاتێك كارێك وات لێدەكات هەست بەدڵتەنگی بكەی. ئەوان دڵتەنگی تۆبەئەركی ئەوان لەسەرت لێكدەدەنەوە .بزانە ئازیزم تۆ لەخۆتەوە هـەروا گـەورە نـەبوی شـەونخونی ومانـدوبونی سـاڵانێكی زۆری ویـست تاگەیشتیت بەم ڕۆژە . زۆرجار سەیری ئەوانت كردوە كەوا دڵیان تەنگ بوە یان خەمیكیان هەبووە هەستت بە ناڕەحەتی كردووە چونكە ئەوكاتەی كەمنداڵ بووی وات دەزانی دنیا تەنها خۆشی تێدایە .بێ گومان ئەوان نەیان دەویست ئازارت بدەن بە ئازارەكانیان بەڵام هەرچۆنیك بێ جار جار هەستت پێیان كردوە .بۆیـە داواكـارم تۆزێـك لـە ئازارەكانیـان قـەرەبوو بكەیتـەوە بـە دڵ گـەورەی وسۆزت بۆیان،

برای ئازیزم كەمنداڵ بووی لەكۆڵان یاریت دەكرد كاتێك شەڕت دەكرد خۆت هەڵدەداوە بەباوكت ،هاوڕێكانت دەترساند بەم باوكت كەئێستا پیر بووەو

بەناوساڵ كەوتووە، لەبەر چاوی تۆ وەك چیا وابوو وات دەزانی كەس نیە وەك ئەو ئازاو چاونەترس بێت. خوشكی خۆم تۆش هەركەبچوك بویت چاوت لەدونیا هەڵێنا یەكەم كەس كە خۆشتویست و دڵت بۆی كردەوە دایكت بوو كە هەڵگری خەمەكانت بوو .هیچ شتێك نەگۆڕاوە ئەوان هەر دایك و باوكتانن با ئێستاش هەر وەك یەكەم جار بێت باوكت هەر ئەو چیایەبێ كەوا بەمناڵی سەیرت دەكرد دڵت نەگۆڕێ لەبەر ئەوەی پیربوون وەتۆش گەورە بووی. یان وابزانی ئیتر پێویستت بە هاوكاری ئەوان نەماوە،هەر چەند ساڵەكان بڕۆن و تۆگەورە بیت و ئەوانیش پیر ببن تۆهەر منداڵی ئەوانی . خودای گەورەش پایەی ئەوانی هێناوەتە تەنیشت پایەی خۆی كەوا لەقورئانی پیرۆز باسی دەكات و دەفەرموێ

(بسم الله الرحمن الرحيم)

وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا {٢٣} وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ صدق الله العظيم ﴿الاسرا﴾

واتا {پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە كەجگە لەو كەسی تر نەپەرستن، هەروەها چاكەكاریشبن لەگەڵ دایك وباوكتاندا هەركاتیك یەكێكیان یان هەردوكیان بەپیری كەوتنە لای تۆئۆفیان لەدەست مەكە وپیایان هەڵ مەشاخێ بەردەوامیش گفتو گۆت لەگەڵیاندا با چاك وجوان وبەجێ بێ_ باڵی میهرەبانی خۆتیان بەسەردا بكێشە وملكەچ بەبۆیان (نزابكەو)بڵێ پەروەردگار روحمیان

پــێ بکــەومهرەبان بــەبۆیان، هــەروەك چــۆن ئــەوان منیــان پــەروەردەکردووە بەبچووکی ومندالّی}ت.ئاسان

کەمنـدالّ بـووی هەرچـەند ئـازاری زۆرت بۆئەوان هـەبوو . لەگـەلّ گریانـت لەگـەلّ بیزارکردنـت لەگـەلّ نەخۆشـیت هـەردەم دەیـان گـووت (گیانەکـەم . ئازیزەکـەم . قوربانـت بم_هتـد)جارێـك قسەیەکی نارێـك وناشـیرنیان پـێ نـەوتی هەرچـەند ئەگەر مندالّ بووی چییان گووتبا تۆنەت دەزانـی وتێنەدەگەیشتی. بـەلاّم ئـەوان دلّیـان نـەهاتووە لـەگولّ ناسـکترت پـێ بلّـێن. بـەلاّم تـۆ ئێـستا دلّـت دێـت قسەی ناشـیرین و قسەی رەق و نابـەجێ بکـەی بەرامبـەر ئـەوان . بەتایبـەتیش دایـك! چونکە بەسۆزترین و دلّ فراوان تـرین کەسـە لەسـەر رویـی زەوی. ئـەبوهورەیرە. رەزای خـــــوای لەســــــەر،لەپێغەمبەرەوە درودی خـــــوای لەســــــەربۆمان دەگێرێتەوەودەفــەرموێ(پیاوێــك هــات بــۆلای ووتــی:کــێ لەهــەموو کــەس شایستەترە کەمن چاکەی لەگەلّدا بکـەم؟ فـەرمووی دایکـت. ووتـی پاشـان کـێ ؟ فەرمووی دایکت. ووتی پاشان کێی تر؟دیسان فـەرمووی دایکـت. ووتـی پاشـان ؟ فـــەرمووی پاشـــان باوکـــت) صـــحیح مـــسلم ص ٨٨٠ زۆرجـــار هەســـت بەنیعمەتــەکان ناکــەین تالەدەســتیان دەدەیــن .ئاگــادارین زوو پــێش ئــەوەی لەدەســـــتتان بـــــچێ کاتەبەنرخـــــەکان کەگەڕانـــــەوەیان زۆرئەســــــتەمە ئازیزانم؟!ئەوکاتانەی دلّیانتان شـکاندوە وپێتـان نـەزانیوە یـان زانیوتانـەو بـەلاّم هـەولّت نـەداوە هەلّـەکانتان چـاك بکەنـەوە.سـەیری ئەوانـە بکـەن کـەوابێ بـاوکن یـابێ دایــك.ئــەوکات هەســت دەکــەی ودەزانــی چ خۆشــیەکە تــۆ تێایــدای.

# باوك

(بسم الله الرحمن الرحیم)

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْـَٔاخِرَةِ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٨٦﴾ صدق الله العظيم ﴿بقرة﴾

واتا {ئەوانەی کەژیانی (بەهەشت)و ڕۆژی دواییان فرۆشتوە وگۆڕیویانەوە بەژیانی دونیا، لەبەر ئەوە سزایان لەسەر کەم ناکرێتەوەو ئەوانە هەرگیز یارمەتی نادرێن وسەر ناخرێن}ت.ئاسان

لەبنەماڵەیەکی مام ناوەندی لەگەڵ دایك و باوکی دەژیا .لەمنداڵی زیرەك و داناو هۆشمەند بوو بە جوانی و بەرێکی قۆناغەکانی خوێندنی تەواو کرد و بو بە ئەندازیارێکی لێهاتوو .

دوایی ژنی هێناو ژیانێکی تایبەتی بۆخۆی بنیاد نا زۆر بەرێك وپێکی خزمەتی دایك و باوکی دەکرد خودای گەورە سێ کوڕی پێدا ساڵ دوای ساڵ دەوڵەمەند تردەبوو تاوای لێهات سامانی بە ژمار نەدەهات دایکی توشی نەخۆشی بوو مرد . دوای چەند ساڵێك باوکیشی مرد،دوای دایك و باوکی سۆزو خۆشەویستی خۆی هەموو دا بەمنداڵەکانی زۆر هانی دەدان بۆ بەرەوپێش چوون سوور بوو لەسەر ئەوەی کەمنداڵەکانی سەرکەون لەژیان و بگەن بەهەموو ئاواتەکانیان کەخۆیان دەیانەوێت چونکە ئەو لەلایەن خۆی هەموپێداویستیەکی بۆ دابین کردبوون،کوڕەکانی گەورەبون و لەگەڵ باوکیان دەست بەکار بوون،باوکیان ڕۆژێك لەگەڵ دایکیان دانیشتبوو، گوتی: بۆ ژن بۆ

کوڕەکان نەهێنین من حەز دەکەم هەموو کاتێك پشتی یەك بگرن من خۆم برام نەبوو بۆیە حەز دەکەم زۆر ئاگاداری یەکتر بن من خۆشی هەموو دونیام بۆ ئەوان دەوێت بۆیە بڕیارم داوە سێ خوشکیان بۆ داخواز بکەم ئەوان خوشك بن و ئەوانەش بران بەڵکو تاماون لەگەڵ یەك بن دایکی کوڕەکان ڕازی بوو بەم ڕاو بۆ چونەی پیاوەکەی ،پاش ماوەیەك ژنی بۆ هێنان هەروەك خۆی دای نابوو.دوای چەند ساڵێك خێزانەکەی مرد کە دەکاتە دایکی کوڕەکانی، باوکی کوڕەکان دوای مردنی خێزانەکەی زۆر هەستی بەتەنیایی و غەمباری دەکرد نەیتوانی زیاتر بەردەوام بێ لەکارکردن ڕۆژێك کورەکانی بانگ کردو گوتی:من توانای کارکردنم نەماوە لەبەر ئەوە کارەکان دەسپێرم بە ئێوە پێشانگای سەیارەو کارگەکان وهتد .... هەموی دەکەوێتە ژێردەستی ئێوە دەبێ زۆر بەچاکی ئاگاداری بن . پاش ماوەیەك ئەندازیارە کە باوکە دڵ گەورەکە کەوتە نێو جێگا کەوتە بەر دەستی کوڕەکان و بوکەکانی. زۆر لێی بێزار ببوون بوکەکانی بەهاوسەرەکانیان دەگوت ئێمە ئیتر ناتوانین خزمەتی باوکتان بکەین دەبێ چارەیەکی بۆ بدۆزنەوە . ئەوانیش دەیان ووت :چی لێبکەین فرێی بدەین . یان بیبەین بۆماڵی خزمەکان بۆمانی بەخێو بکەن خۆشتان چاك دەزانن باوکمان لە ئێمە زیاتر نەبرای هەیەو نەخوشك . ئەوە حاڵیان بو تاماوەیەکی زۆر تا ڕۆژێك گوتیان : پێتان شەرمە فرێی بدەن دەباشە بیبەن بۆ جێگای بەخێو کردنی پەك کەوتەکان (دارالمسنین) کوڕەکان گوتیان چۆن ئێمە ئەو کارە بکەین خۆ ئێمە ناودارین و خەڵك دەمان ناسێ بەڵام ئەوان هەر لەسەر قسەی خۆیان بوون،ووتیان باخەڵك نەزانێ و ناوی ڕاستەقینەی تۆمار مەکەن تاکو ڕازیان کردن باوکیان ببەن بۆ جێگای پەك کەوتەکان. حەبێکی خەویان بۆ باوکیان خستەناو چایەو خەوی لێکەوت هەڵیان گرتوو بردیان بۆناو ئۆتۆمبێلی یەکی لەم سێ برایە تاکو بیبەن بۆئەو جێگایەی کە بەهەمویان ڕازی بون باوکیان لەوی'فرێبدەن گەیشتنە جێی مەبەست چونە لای بەڕێوبەرو

گوتیان : ئەو پیرەمێردەی لەناو ئۆتۆمبێل خەوی لێکەوتوە لە سەر شەقام کەوتبوو ئێمە دۆزیمانەوە وەزۆر پرسیارمان کرد لە کەسو کاری بەڵام دیارە کەسی نیە بۆیە هێنامانە ئێرە لەسەر خەرجی خۆمان ئاگاداری دەبین هەر چەندە نایناسین بەڵام ئەم کارە دەکەین بۆ ڕەزامەندی خودا .

بەڕیوبەری جێگاکە زۆر ئەو کارەی ئەوانی بەدڵ بوو گووتی ڕاستە هێشتا خەڵکی باش ماوە بەڕاستی جێگای خۆش حاڵیە ئەوکارەی ئێوە خودا پاداشتتان بداتەوە.

پارەیەکی زۆریان پێدا.گوتیان هەرکاتێ پارمەتیت ویست تەلەفۆن بکە ئێمە ئامادەین بۆ هەر یارمەتیەك.وەئەگەر ئەو پیرەمێردە مرد ئێمە چاکەی خۆمان تەواو دەکەین کفن ودفنی بۆ دەکەین وبەخاکی دەسپێرین بەڵکو خودای گەورە بەو چاکەیە لیمان خۆش بێت وخێریشمان پێدەگات.

ژمارەی تەلەفۆنیان جێ هێشت و ڕۆیشتن.باوکیان بەجێهێشت لەم جێگایە کە تەنها بۆ بێکەسانە. نەوەك یەکیك کەوا سێ کوری هەبێ بەڵام جێگای ئەو جێگایەبێ؟

چەند سعاتێکی پێ چوو باوکیان هەستا لەخەوەکەی وای زانی هێشتا لەماڵە بانگێ بووکەکەی دەکردو دەیکوت کچەکەم کاتی نوێژ هاتووە تا بچم دەست نوێژ بگرم وابزانم ماوەیەکی زۆرە خەوتووم.دووبارەی کردەوە بەڵام هیچ وڵامێك نەبوو چاوێکی بەدەوری خۆی گێڕا سەری سورما گووتی؟من لە کوێم ئێرە کوێە بە بەسالاچوەکانی دەوری گووت ئێوە کوێن من لێرە چیدەکەم چۆن هاتووم بۆ ئێرە دیارە من خەون دەبینم وخەبەرم نەبۆتەوە.بەسالاچوەکانی چوار دەوری گووتیان تۆ لەلای ئێمەی بەخەبەری ئەوەخەون نیە ئێرە جێگای بەخێوکردنی پەکەوتەکانە تۆش لەلای ئێمەی، دیارە بێکەسی نەوەك لە سەر شەقامەکان نەدەکەوتی خوا خێری ئەو گەنجانە بنوسێ کەتۆیان هێنا بۆ ئێرە.پێمان بڵی ماوەی چەندە لەشەقامەکان ژیان دەبەیتە سەر؟

گـــووتی ئێوەچـــی دەڵـــێن.بێکەســـی چی؟شـــەقامی چـــی؟گەنجی چی؟باســـی چیدەکەن؟

ئەوانیش گووتیان ئەدی تۆ لە سەر شەقامەکان نەکەوتبوی ئەوگەنجانە تۆیان هێنا ئێرە تاکوو یارمەتیت بدەن لەبێکەسی رزگارت بکەن وشوێنیکت بۆ دیاری بکە ئەو ماوەی لەژیانتدا ماوە بە ئارامی بژی.

گـوتی دەتـوانن ئـەو گەنجانـەم بـۆ وەصـف بکـەن .کـە وەصـفیان کـردن . زانـی کورەکـانی خـۆیتی .ئـاخێکی قـوڵی هەڵکێـشاو گووتی؟دەتـوانم بەرێوبـەر ببیـنم بردیـان بـۆلای زۆربـەرێکی سـەلامی کـردوو گوتی؟بـەرێز تـۆ (فـلان کـوری فلان)دەناسـی ئـەویش گـووتی چـۆن نایناسـم کـەس هەیـە ئـەو نەناسـی.راسـتە نـەمبینیوە بـەلآم ناوبـانگم بیـستوە .بـاوکی کورەکـان گـووتی ئـەو کەسـە منم.!

بەرێوبەر زۆر سەرسام بوو چۆن.!باشە تۆ چۆن وات لێهاتوە کەی ئاوا زەرەرت کردوە چۆن وچۆن...هتد.

گووتی سەرسام مەبە ئێستا هەموو شتێکت بۆ باس دەکەم ئەگەر کاتت هەبێ بتـوانی گـوێم بـۆ رابگـری .بەرێوبـەرگووتی.بەراسـتی زۆر بەپەرۆشـم بـزانم ئـەم روداوە چۆنە، فەرموو باسی بکە بۆم!

هـەمووی بـۆ گێرایـەوە بـەوردی ئـەویش گـوێ بۆراگرتبـوو نـاوە بـەناوەش هەناسەیەکی ساردی هەڵدەکێشاو چاوەکانی خۆی دەسری.

پاشان روی لە بەرێوبەر کردوو گووتی بەیانی لەگەڵم وەرە دەچین بۆ شوێنیك.

ئـەویش گـووتی دیـارە نیـازت وایـە بگەرێتـەوە بۆمـاڵ.گـووتی مـن کورەکـانم دەرنەکردوە لە ماڵ ئەوان منیان دەرکرد چۆن دەتوانم جارێکیتر سەیریان بکەم من ژیانی خۆم نەهاتە پێش چاو هەوڵدان وکارکردن وماندوبونم هەربۆئەوان بۆ تاکو ژیانێکی ئارامیان بۆ دابین بکەم بەپشتیوانی خودا گەیشتم بەو ئاواتانەی کە رۆژێك لە رۆژان بەهیوا بوم بۆی بـەلآم بەرامبەرئەوە بـاجێکی زۆر گـەورەم دا ئـــەویش خۆشەویـــستی منداڵـــەکانم بـــوو.وەخۆشەویـــستی مـــن بۆئـــەوان

کەبەهەمووماڵ وسـامانی دونیـا ناکڕێـت. بەڕێوبـەر گـوتی ئـەی بـۆ کـویٚ بـچیٚ؟باوکە دڵ پڕئازارەکـە گـووتی دەچـم ئـەو موڵکانـەی هێشتا لەسـەر نـاوی خۆمـە نەیفرۆشـم پارەکـەی دادەنـیم لـەبانك بەشـێکی بـۆ خێـرو چـاکە.وە بەشـەکەیتری بـەناوی ئـەم دەزگـا خێرخوازییەدەکـەم کـەپێی دەڵـێن جێگـای بەخێوکردنی پەکەوتەکان بۆئەوەی هەردەم دەرگـای کراوەبێـت بـەڕوی چـەندەها کەسـی وەك مـنی بێکـەس وبێلانـە.بـەیانی چـوون وایکـرد کـەخۆی ئامـاژەی پێکرد.کاتێك گەڕانەوە گووتی داواکاریەکی ترم هەیە.
بەڕێوبەر گووتی داواکاریەکانت بەچاوان جێبـەجیٚ دەکـەم ئەگـەر بتـوانم.گـووتی داواکاریەکەم ئەوەیە ئەگەر مردم خەبەرمـەدە بەکوڕەکانم هـەر بـەخۆتان بـەخاکم بسپێرن.توخودا دوای مردنم جار جار یادم کەن بەفاتیحەیەك.
بەڕێوبـەر دەڵیٚ؟چـەندمانگیك لـەلای ئێمـە مایـەوە بـەهۆی خـەم وخەفەتـەکان نەخۆش کـەوت لەبەر ئازاری دەرونـی مـرد .دەڵـی ئـەو مـاوەی لـەلامان بـو تـەنها نەمدیت جارێك پێبکەنی یـان زەردە خەنەیـەکم نـەدیت بەڕویـەوە هـەر دەیگـووت من هیچ کات خراپ نەبوم بۆکوڕەکانم هەر داواکاریەکیان هەبوایە بەزوترین کات بۆم جێبەجێدەکردن باشە بۆ ئاوایـان کـرد لەگـەڵم بۆچیٚ ها؟زۆر دڵـم دەدایـەوە پێمـدەگوت زۆر کەسـی تـر وای بەسـەر هـاتووە دونیـا لـیرە ناوەسـتی هـەر بەردەوامە وا لەخۆت مەکە.هـەر ئەوەی بەسـەرهاتەکەی بۆمـان گێڕاوە دەڵـی مـن کوڕەکـانیم نـەدیت هـەر لەوکاتـەی هێنایـان بـۆئێرە هـەتا چـەند مانگێـك دوای مردنـی باوکیـان .ڕۆژێـك هـاتن بـۆ ئـەوەی بـزانن چـۆن وکـەی باوکیـان ئـەو موڵکانەی فرۆشتوە.!خودای گەورەش لەقورئانی پیرۆز دەفەرموی:

(بسم الله الرحمن الرحيم)

أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾ صدق الله العظيم ﴿ال عمران﴾

واتا {ئایا کاتێ توشی بەلآوناخۆشیەك بوون،بۆدەڵێن ئەوەچی بوو بۆوامان بەسەرهات ،ئینجا پێ یان بڵێ :ئەم بەلآیە بەهۆی خۆتانەوە توشتان هات، بەڕاستی خوادەسەلآتی بەسەرهەمووشتێکدا هەیە} ت.ئاسان

(هەردەم بزانن خۆشی وناخۆشی تاسەر بەردەوام نیە بۆکەس)!



# دایك

من ناوم(ك) تەمەنم ١٥ساڵە لە بنە ماڵەیەکی دەوڵەمەندم ئەم بەسەرهاتەتان بۆ دەگێرمەوە کە لەگەڵ ئێمە رویداوە.

رۆژێك باران بوو کەماوەی سێ رۆژبوو باران بەردەوام دەباری سەرما کاری لێکردبوین دەرگاو پەنجەرەکانمان داخست بوو منیش زۆر دڵم توندبوو چونکە چەند رۆژێك بوو نەمتوانی بچم بۆ دەرەوە .دەستم کرد بە هاتوو چۆ لە ژوورەکە کەلە نهۆمی دووەم بوو لەلای پەنجەرەکە وەستام سەیری شەقامەکانم دەکرد لەگەڵ دایکم و برا گەورەکەم وخوشکە بچوکەکەم قسەم دەکرد . لە ناکاو شتێکی سەیرم دیت ئەویش منداڵێکی تەمەن ٨ساڵان لە سەر شەقامەکە وەستابو زۆر غەریب وسەیر هاتە بەرچاوم گوتم دیارە بزر بووە ،ماوەیەکی پێچوو ئەو هەر لەوجێگایەوەستابوو ماڵەوەم ئاگادار کردەوە ئەوانیش سەرسام بوون گوتیان منداڵێکی بچوك بەم رۆژە ساردە چیدەکات لەدەرەوە.کەمێکی پێچوو لەجێگای خۆی دانیشت. بەدایکم گووت من دەچم بۆلای پرسیاری لیدەکەم .! چاکێتەکەم کردە بەرم بەپەلە چوم . سەیرم کرد جلوبەرگی هەموی بۆتە ئاو هەرچەند ویستم قسەی لەگەڵ بکەم نەیتوانی ولآمم بداتەوە لە سەرمان زمانی گیرابوو هیچ جولەی نەمابو.چاکێتەکم لەبەر خۆم کردەوە لەمنداڵەکەم پێچا و لە باوەشی خۆم کردوهێنامەوە بۆ ماڵ دامان نا لەنزیك سۆپاکە وجلوبەرگەکەیمان گۆری دایکم پەرداخێك شیری بۆ هێنا.خەوێکی قولی لێکەوت لەلامان مایەوە ئەو شەوە بەبێ ئەوەی بزانین ئەم منداڵە کێیە!.بەیانی پرسیارمان لێ کرد تۆکێ؟بۆچی بەوبارانە لەدەرەوە بوی ئایا تۆ ونبوی لەماڵ؟دەستی کردبە گریان. ئێمەش بەهەموو جۆری دەمانویست کپی بکەینەوە.دایکم لە باوەشی خۆی گرتبوی پێدەگوت رۆڵەگیان مەگری ماڵتان دەدۆزینەوە دەتگەرێنینەوە ،هەرچەندئێمە ئەو قسانەمان بۆیدەکرد ئەو زیاتر دەگریا.دوای کەمیك بێدەنگی گوتی من بزر نەبومە ماڵی خۆمان پێدەزانم

منیش گوتم باشە لەگەڵت دێم دەتگەڕێنمەوە. گوتی من ناتوانم بچمەوە لێمدەدەن،گووتمان بۆ لێت دەدەن کێە ئەوکەسە باوکتە یان دایکت. گوتی زڕ باوکم،برا گەورەکەم گوتی دیارە کارێکی خراپت کردووە؟
بەدەستە بچوکەکانی فرمێسکەکانی دەسڕی وگوتی ! من کار دەکەم بۆ زڕ باوکم لە بازاڕ پاکەت وچەرخ دەفرۆشم دوێنێ کە هاتمەوە بۆماڵ باران زۆر بە قایم دەباری منیش دەترسام وهەر ڕامدەکرد ئاگام لێنەبووە هەندێك لە پاکەتەکان بەربوینەوە چونکە هەموو ڕۆژێك لە کاتی دەرچون وهاتنەوەم دەیان ژمێرێ و حیسابیان دەکات .گووتی کوانی پارەکان منیش ئوەندەی لەلام بوو دامی،گووتی زۆری کەمە !هەرچەند ووتم لەبەر ئەوەی بەڕاکردن هاتمەوە لێمکەوتون :باوەڕی نەکرد لەبەر ئەوە زۆری لێدام. منی دەرکردو ووتی بڕو یا پارەکەم بۆ بێنەوە یان پاکەتەکان،
گووتمان ئەدی دایکت؟ ووتی دایکم هیچ دەسەلآتی نیە، (لەپێش خۆی زۆری جوێن دا بە زڕ باوکەکەی) . فرمێسکەکانی بەگوڕ دەهاتنە خوار لەسەر ڕومەتە ناسکەکەی گووتی ئەگەر باوکم بمابوایە ئاوام لێنەدەهات .دایکیشم لەگەڵ ئەو دەگریا وفرمێسکەکانی خۆی وئەوی دەسڕی.
براکەم گرتیە باوەشی خۆی وگوتی گیانەکەم مەگریێ من وەك باوکتم خوشکە بچوکەکەمان هاتە نزیك و گووتی تۆ ناوت چیە ؟گوتی(ه)
منیش شتێکم بە خەیاڵ داهات بەخێزانەکەمانم گوت ڕاتان چۆنە سەردانیکی ماڵی (ه)بکەین داوا لە دایکی و زڕباوکەکەی بکەین کەوا ڕێبدەن بۆ خۆمان بەخێوی بکەین ئەگەر پارە شیان داواکرد ئێمە هەر ڕازین بەس تەنها بتوانین لەدەستی ئەوان بیهێنێنە دەر.،
ئەوانیش بیروکەکەیان پێ باشبوو،من وبرا گەورەکەم دەستی منالەکەمان گرتوو چوین ،لە دەرگاماندا دایکی دەرگای کردەوە چاوی بە کوڕەکەی کەوت گرتیە باوەشی گووتی گیانەکەم لە کوێ بوی ئەو شەوە من هەر گریاوم نە

مـدمزانی چیتلێهاتوه. گـوتی ئێـوه هێناتانـەوه مـن نـازانم چیتان پێبڵـیم چۆن سوپاسـتان بکـەم، براکـەم گـوتی سوپاسـی نـاوی..پیاوەکـەت لەماڵـه دەمانـەوی هەنـدێ قسەی لەگـەڵ بکـەین؟ڕەنگی تێکـچوو گـوتی بۆ کوڕەکـەم هیـچی کـردوه ،بەمن بڵێن توخدا با ئەو نەزانی گوتمان هیچ نیه مەترسه (ه) هەموو شتێکی بۆ باس کـردین ئێمـه هـاتوین داواتـان لێبکـەین ئەگـەر ڕێ بـدەن لەگـەڵ ئێمـه بـڕی پێمـان خۆشـه ئـەرگی بـەخێوکردنی بگرینـه ئەسـتۆ.؟گـوتی ئێـوه بەڕاسـتی وادەکـەن؟گوتمان بـەڵێ هـەر بـۆ ئـەوه هـاتوین. گـوتی زۆرم پێخۆشـه ئەگـەر ئاگاداری کورەکەم بن من ڕازێم هەر ئێستا لەگەڵ خۆتانی ببەنەوه تا پیاوەکـەم نەهاتۆتـــەوه.خـــەریك بـــوو دەرۆیـــشتین کەزڕباوکەکـــه هاتـــەوه یەکـــسەر پـەلاماری(ه)داو گـووتی من لەبەیانیـەوه بەدوات دەگـەڕیم تۆ لـه کوێ بوی ها؟ دەستمان گـرت و نەمانهێشت لیبدات گـوتی ئیـوه کێن ڕوی لـەدایکی (ه)کـردو گـوتی دەبیـنم خـزم وناسـیارت بـۆ پەیـدا بـووه .گوتمـان ئیمـه هیـچی ئـەونین هـاتوین ئـەو منداڵـه لەگـەڵ خۆمـان ببـەین،ووتی چـۆن چـۆنی دەیبـەن؟گوتمان هەرچـۆنیك تۆپێـت خۆشـبێت؟ ڕازی بـوو بـەپاره ، زۆر بـەبێ منـەتی ووتـی ئیمزاشتان بۆ دەکەم کە جارێکی تر نامەوێ بیبینم .

هێنامنەوه دایکم زۆر دڵخۆش بوو، زۆرمان خۆشدەویست ناردمان بۆ قوتابخانه منداڵێکی ئاقل وژیر گوێڕایەڵ بوو دوای شـەش سـاڵ سـەرەتای تـەواو کـرد لـەو کاته دایکم تەندروستی باش نەبوو زۆر خەمی بووهەردەم لەلای دادەنیشت ولـه ئـەحواڵی دەپرسـی .ئـەمری خـودای گـەورە ڕەتبونـەوەی نیـه.دایکـم مـرد(خـوا لیخۆش بێ بە بەهەشتی بەرینی شادکا) (ه) زۆر لەئێمـه زیـاتر بۆی پـەرۆش بۆ دەگریـاو دڵـی دەسـووتا دەیگـوت دوو جـار یـەتیم بـوم..دوای چـەند سـاڵێك قۆناغی ناوەندی تەواو کـرد.خوشکەکەمان شـوی کـرد منـیش ژنم هێنـا ئـەویش کۆلێـژی تـەواو کـرد لـه ڕۆژی دەرچـونی زۆر دڵ خـۆش بـوین براگەورەکـەم و ژنەکەی ومنداڵەکانی .خوشکم و پیاوەکەی و منداڵـەکانی .مـن و ژنەکـەم لەگـەڵ

منـدالّكانم لـە هـەموو لایـەك دەسـت خۆشـی وپـیرۆز بـایی بـوو مامـە.مامـە و خالّـە.خالّـە دەنگـی دەدایـەوە سـەیرمان كـرد (دكتـۆر.ه)فرمێسك لـە چـاوەكانی دێتە خوار پرسیمان برا گیان چیە بۆ دەگری گوتی لە خۆشیان دەگریێم ئێمەش پێكەنین گوتمان تۆ لەخۆشی و ناخۆشی دەگریی باشە چۆن ڕازیت بكەین، ماوەیكی پێچوو ڕۆژێكیـان سـەیرمان كـرد پیاوێك هاتـە مالّمـان گـوتی هـاتووم بۆئـەوەی كوڕەكـەم ببمـەوە ناسیمانەوە ئـەو پیـاوە پـیرە زڕباوكـە دلّ ڕەقەكـەی (دكتۆرە)گوتمان كوری چی تۆ باسی چ دەكەی .!

گـووتی (ه) كـوری منـە هـاتوم لەگـەلّ خـۆم ببەمـەوە بـۆلای دایكـی هـەموكات یـادی دەكـات وچـاوەكانی خەریكـە لەدەسـت بـدات بـەهۆی زۆرگریـان.ئێمـەش بانگمان كـردوو گوتمـان بـەخۆت دەزانـی چیت پێباشـە بیكـە ئێمـە ڕازیـن بەهـەر بڕیاریك كە باشبێت بۆت بەئارەزوی خۆت براگیان.

ئـەویش ڕوو لـە زڕباوكەكـەی كـردو "گـووتی مـن ناگەڕێمـەوە بـۆ لات .ئـەویش ڕۆیـشت بـەلّام دوای چـەند ڕۆژێـك دووبـارە گەڕایـەوە.(دكتـۆر)هـەر ڕازی نـەبوو بــچێتەوە لەگــەلّی. ماوەیــەكی تــری پێــچوو ڕۆژێــك هــەمومان بەیەكــەوە دانیشتبوین دیتمان ژنێكی پیر لەدەرگایـداو هاتـە ژوور لەگـەلّ چـاوی پێكـەوت ئەو گەنجە ڕایكردە لای ودەستی لەمل كردوو دەستی ماچ كردو گوتـی دایەگیان چۆنی .ئەویش ماچی كرد.،هێنـای لەتەنیشت خـۆی داینـا ئێمـەش زۆر ڕێزمـان گرتـوو گوێمـان بـۆ گـرتن (ه) گـوتی :دایـە چـۆنە منـت بـیر كەوتـەوە دوای ئـەو هـەموو سالّە؟ گـوتی ڕۆلّـە گیـان مـن ڕۆژێـك تـۆم لـەبیر نـەكردوە بـەلّام چیبكەم .بەرگەی ئازارەكانم گرت بۆ ئەوەی بتوانی بەخۆشی بژی دور لە دەستی ئەو بێ ویزدانە ئیستاش من تاقەتم نەما لەدوریت ژیانیشم ئەوەندەی نـەماوە كۆتـایبێ بۆیە هاتم بەدوات .دایكەكە ڕوی لەئێمە كردوو گووتی من نازانم چۆن سوپاسی ئێـوە بكـەم .ئێـوە فریـشتەبون لـەوكات كـە بـەفریای كوڕەكـەم هـاتن مـن هـەردەم دوعای خێرم بۆ كـردون مـن نـاتوانم چاكەی ئێوە بدەمـەوە بـەلّام خـودای گـەورە

پاداشتان بداتەوە ئەگەر ئێوە نەبونایە کێ دەیزانی کوڕەکەم دەبو بە چ جۆرە کەسێك، گوتمان وامەڵێ ئێمەنەبوین بەڵکو خودا ئێمەی ڕێنموی کردو کردینی بەسەبەبێك تاکوڕکەت بەواتایەکی تر برا ئازیزو بەڕێزەکەمان بگاتە ئەوەی کەوا شایستەیەتی. ووتمان دکتۆر گیان چی دەڵیی ڕازی لەگەڵ دایکت بڕۆی .گوتی ناتوانم دایکم بە دڵێکی سارد ڕەوان بکەمەوە بەلاّم دەترسم پێم بڵێن کەسێکی سپڵەی .گوتمان هیچ کات واناڵێن چونکە تۆ دەناسین دەزانین لەبیرمان ناکەی زوو زوو سەردانمان دەکەی .! زۆر داوای لێبوردنی کردوو دیسان کەوتە گریان گوتمان ئەوجارە بۆدەگریێ ،گوتی هەرچەند دڵم خۆشە بەگەڕانەوەم بۆ لای دایکم بەلاّم دڵم بۆدوریتان هەست بە ئازار دەکات..دەستی دایکی گرتوومالّ ئاوای کردوهێدی هێدی کەوتنەڕێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾ صدق الله العظيم ﴿الفرقان﴾

واتا : {مەگەر ئەوکەسەی کەتەوبەبکات وباوەڕ بێنێت وکاروکردەوەی چاکە ئەنجام بدات،ئەوجۆرە کەسانە خوا کردەوە خراپەکانیان بۆدەگۆڕێ بەچاکە، چونکە بەردەوام خوا لێخۆشبوو میهرەبانە}ت.ئاسان.



# كورە بێ ئەقڵەكە

هەرلە منداڵی عینادو كەلەڕەق بوو كە گەیشتە تەمەنی هەرزەكاری زیاتر بەردەوام بو لەسەر عینادیەكەی هەر كاتێك كارێكیان پێ بسپاردبا ڕوی خۆی وەردە گێڕاو وای دەكرد كەوا لەگەڵ ئەویش قسەناكەن گوێی بۆ هیچ ئامۆژگاریەك ڕانە دەگرت . باوكی زۆری لێدەدا زۆر جاریش لەگەڵ لێدان لە هۆش خۆی دەچو بەڵام بێ سود بوو ئامۆژگاری و لێدان و ترسان بەهیچ جۆرێ بەخەیاڵی دا نەدەهاتو گوێی پێ نەدەدا گەیشتە تەمەنی بیست ساڵی توشی هاوڕێی خراپ هات،باوك و دایكی وایان لێهاتبو هیچ ئومێدێكیان نەمابوو بۆ چاك بوونی ڕەفتاری كوڕەكەیان،پێیان دەگوت بۆ وا لە خۆت دەكەی بۆ بە كردارەكانت ئازاری ئێمەش دەدەی نە خوێندنەكەت تەواو كردو نەكارێكت بۆ خۆت كرد ئێمە هەچمان لەتۆ ناوێ وەچاوەڕێی هیچت لێ ناكەین تەنها دەمانەوێ وەك مرۆڤێكی ئاسایی بۆخۆت بژی ، كوڕم لەگەڵ هاوڕێی خراپ مەگەڕێ تادرەنگی شەو لەسەر جادەكان مەسوڕێوە ئاقل ژیربە لەسەر شەقام و كۆڵانەكان مەوەستە سەیری ناموسی خەڵك مەكە. بەڵام ئەو وای دەزانی ئەوان گوێزی بۆ دەژمێرن بە خەیاڵیشی دانەدەهات لەسەر كەلە ڕەقی و بێ باكی و كەم تەر خەمی وناسینی هاوڕێی خراپ بەردەوام بوو.

ڕۆژێك لە دەرگای ماڵیان درا دایكی دەرگای كردەوە لەناكاو كردی بەهاوار چی بووە؟ كوڕەكەم چیەتی گوتیان بانگی باوكی بكە باوكی بەغار هات سەیری كرد پۆلیس لەبەردەرگایانەو پرسیاری كوڕەكەی دەكەن گوتیان : كوڕەكەت لەماڵە؟ ئەویش بەتاسەوە گوتی: نەخێر لەماڵ نیە . ئەی دەزانی لەكوێیە ؟ گوتی : نازانم بەڵام چی بووە ! بۆ پرسیار دەكەن ئایا شتێك بووە؟ گوتیان: خاڵە گەردەزانی لەكوێیە پێمان بڵی بۆتۆ باشترە شاردنەوەی هیچ سودێكی نیە باوكە بێدەسەڵاتەكەگووتی: بڕوام پێبكەن سوێندتان بۆ دەخۆم كەنازانم لەكوێیە لەدوێنێوە چۆتە دەرو نەهاتۆتەوە بەدرێژایی شەو من و دایكی

خەومان لێنەکەوتوە دەمان گوت دەبێ چی ڕوی دابێ بۆ نەهاتەوە ڕاستە درەنگ دەهاتەوە شەوەکانی تریش بەلاّم ئەم شەوە هەر نەهاتەوە ، دەتخوا پێم بلێن چی بووە کوڕەکەم چی لێهاتوە خەریکە دڵم دەوەستێ !

ئەوانیش گوتیان :خاڵەکوڕەکەت لەگەڵ دووانی تر پیاوێکیان کوشتوەو سەیارەکەیان ڕفاندوە بەلاّم لەبەینی خۆیان پێك نەهاتوون لەیەکێك لە هاوڕێیەکانی خۆیان داوە و بەسەختی بریندارایان کردووە وایانزانیوە مردوە هەر لەبەر ئەوە جێیان هێشتوە ئێستا ئەو لەنەخۆشخانەیە هەر ئەو ناو وناونیشانی کوڕەکەی تۆ و هاوڕێیەکەی تری داوە خاڵە گەر کوڕەکەت هاتەوە یان هەر شتێکت زانی دەربارەی شوێنی پێمان ڕابگەیەنە . دوای پشکنینێکی وردی ماڵەکە ڕۆیشتن .

باوکی کوڕەکە بە خێزانەکەی ووت:باشە کوڕەکەمان بۆ وای لێهات ئێمە بۆنەمان توانی شتی باشی فێر بکەین یان خەتای من بوو هەر لە منداڵی فێری پارەی زۆرم کردو تەنها جارێ داوای شتێکی کردبا بۆم دەهێنا بەردەستی نازی زۆرم پێی دابو دایکی کورەکە دڵنەوایی پیاوەکەی دەدایەوەو دەی گووت خەتای ئێمەی تێدابوو بەلاّم ڕەوشتی خۆی جوان نەبوو هەر لەمنداڵی سەر سەخت بوو گوێرایەڵ و ئاقڵ نەبوو، والەخۆت مەکە تۆ خۆت نەخۆشی دەترسم شتێکت لێبێ هەر دەگریان و ئەم قسانە یان دەکرد ،دوای سێ چوار ڕۆژ شەوێکی درەنگ لە حەوشەکە چرپەیەك هات باوك لە پەنجەرە سەیری دەرەوەی کرد بینی کوڕەکەیەتی لە دەرگای نەداوەو لەسەر دیوارەکە هاتۆتە حەوشەکە بە ڕاکردن چوبۆلای و گوتی: ئەوە بۆ وات کرد تۆ لەچیت کەم بوو بۆ ئابروت بردین ، کوڕەکە بەتوڕەیی بە باوکی گوت کاتی ئەم قسانە نیە ئێستا تۆ چارەیەکم بۆ بدۆزەرەوە چی بکەم، ئەویش گوتی کات درەنگە وەرە بچینە ژورەوە تۆزێك بخەوە دوایی چارەیەکی بۆ دەدۆزینەوە،بەقسەی خۆش بردی بۆ ژورەوە لە لای دانیشت تا خەوی لێکەوت چوو بۆ ژورەکەی ترو دایکی

كوڕەكەی بانگ كرد چاوت لێبێ ڕانەكات ئێستا دەچم پۆلیس ئاگاداردەكەمەوە من ناتوانم هیچیتر لەسەر ئەم كردارانەی بێدەنگ بم،دایكی كوڕەكە ووتی وامەكە بەدەستی خۆت كوڕەكەت لە زیندان مەكە دوایی پەشیمان دەبیتەوە ، ئەویش گوتی لەچی پەشیمان دەبمەوە من لە ڕابردوم پەشیمانم .

پۆلیس هات قۆڵبەستیان كرد،باوكە گوتی كوڕم ئەو دەرسەی كەمن نەمتوانی فێرتی بكەم با زەمانەفێرت بكات با ڕۆژگارەكان و ناخۆشی و تاڵی ژیان فێرت بكەن ، تۆ دەبێ هەر باجەكەی بدەیتەولە خراپەكان كە كردوتە من ڕازیم بە هەرجۆرە سزایەك كە بۆتی دادەنێن بەڵكو تاوانەكانت كەم بێتەوە بۆ ژیانەكەی تر بەلاّم كوڕم تەنهالەوە پەشیمانم كەنەمتوانی بە جوانی پەروەردەت بكەم وە هەتا دەمرم هەر ئاخی ئەمە هەڵدەكێشم ئایا هەڵەی من لەكوێ بوو لە پەروەردە كردنت:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ وَإِن تَعْفُواْ وَتَصْفَحُواْ وَتَغْفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ صدق اللة العظيم {التغابن}

واتا: {ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە(جاری واهەیە)هاوسەرانتان وڕۆڵەو نەوەكانتان دژایەتیتان دەكەن،ئێوە وریابن لەهەڵس وكەوتنتان لەگەڵیاندا،جائەگەر لێیان خۆش بن وچاوپۆشیان لێ بكەن ولێبوردەبن ، ئەوە باش بزانن خوا زۆر لێخۆشبووە وزۆریش میهرەبانە} ت.ئاسان.

# پیاوێکی پەك کەوتە وکوڕەکەی

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ صدق الله العظيم ﴿الاسرا﴾

واتا {باڵی میهرەبانی خۆتیان بەسەردا بکێشەو ملکەچ بەبۆیان،(نزابکەو)بڵێ: پەروەردگارارەحمیان پێ بکەومیهرەبان بەبۆیان هەر وەك چۆن ئەوان منیان پەروەردە کردووە بە بچووکی ومنداڵی}ت.ئاسان

لەم بەسەرهاتە باسی گەنجێك دەکەین کە پێنج براو سێ خوشکی هەبوو.ناوی ع . بوو لەخوشك و برایەکانی بچوکتربوو لەگەڵ دایك وباوکی دەژیا.چونکە براکانی ژنیان هێنابوو خوشکەکانی شویان کردبوو .

ع خوێندکاری کۆلێژ بوو. کەدەگەڕاوە بۆماڵ یارمەتی دایکی دەدا لەکاری ماڵ چونکە ماوەی دووساڵ بوو باوکی (جەڵتە)لێدابوو لەدەستوو قاچ کەوتبوو دایکیشی بەتەمەن بوو پێویستی بەیارمتی بو نەخۆشی دڵ و چەندین نەخۆشی تری هەبوو، بەلاّم ئەوەی کە ع چاوەڕێ نەدەکرد ڕوویدا ئەویش مردنی دایکی بوو دوای ماوەیەکی کەم خوشك وبراکانی هەمویان چونەوە بۆماڵی خۆیان . ع وباوکیان جێهێشت. ئەو گەنجە ئاگاداری باوکی بوو نەیتوانی چەندمانگیك بچێ بۆ خوێندن ، ڕۆژێك یەکێك لەبرایەکانی هات ع گووتی ؟براگیان ئەگەر ئەوهابێت خوێندنم پێ تەواو ناکرێ من ئەمساڵ و ساڵێکی ترم ماوە،بەخۆشتان باش دەزانن ناتوانم باوکمان بەجێ بێڵم لە بەیانی تا دوای نیوەڕۆ زۆر جار وایە دەگاتە دوای عەسر من ناگەڕیمەوە .یارمەتیم بدەن ئەم ماوەیە تاخوێندنم تەواو دەبێت.هەر یەکێك لەئێوە با یەك دوومانگ

بیباتـە لای خـۆی تکاتـان لێدەکـەم .ئـەویش گـوتی باشـە بـەیانی دێمـەوە لات"ڕۆیشت چەند ڕۆژێکی پێچوو دوای هاتەوە گوتی باشە لەگەڵ خۆم دەیبەم هەنـدێك جلوبـەرگی ئامادەکـە بیخـەرە ناوئۆتۆمبێلەکـەم زووکـە، ع زۆری پێخۆشبو ئەو هەڵویستەی براکەی زۆرسوپاسی کرد!.چەند ڕۆژێکی پێچوو زۆر بیری باوکە پەکەوتەکەی کرد گووتی ئەمڕۆ دەچم بۆدیتنی.

چوو بۆمـاڵی براکـەی سـەلامی کـردوو دانیـشت زۆرچـاوی گێـرا بـاوکی نـەدیت سەیری کرد براکەی وبراژنەکەی هەر سەیری یەکتری دەکەن .گووتی؟کوا باوکم لەکامە ژووره چیبوه بو ئاوا سەیری یەکتری دەکەن ودەنـگ ناکەن هەستایەوەو لەژوورەکان بەدوای گەڕا بەلاّم لەهیچ شـوێنیك نـەبو ع هـاواری کـرد؟ کـوا بـاوکم شتێکی لێبەسەر هاتوو!براکەی دەستی کردە ملی و بـردی بـۆ حەوشـەکە گـوتی بەخوا باوکت هیـچی لینـەهاتوو بـەلاّم دوو ڕۆژ لـەلامان بـو خێزانەکـەم نـەیتوانی بەتەنها ئاگاداری بێت بەخۆشت دەزانی من لەماڵەوە نـیم کـاتم کەمـە . ع گـووتی ئێستا لە کوێیە؟ ئەویش گووتی. پێش چوار ڕۆژ بردم بۆ ماڵی ( )برامان .

بـەزوویی چـوو بـۆ مـاڵی براکـەی تـری سـەلامی کـردو چـو بـۆ ژوورو چـاوی گـێڕا دیـتی براکـەو براژنەکـەی هـەر وەك ئـەوانی تـر سـەیری یـەکتر دەکـەن براکـەی ویستی قسە بکات ع گووتی (دەزانم خۆت ماندوو مەکە.باوکم هیـچی لێنـەهاتوە بـەلاّم خێزانەکـەت نـاتوانیّ بەتـەنها ئاگـاداری بێـت دەشـزانم تـۆ کاتـت نەیـە یارمەتی بدەی)ئێستاش پێم بڵـی باوکمت بۆ کویّ برد. گـووتی بـردم بـۆ مـاڵی بـرات( ) دیـسان ملـی ڕی گرتـوو چـوو بـۆ مـاڵی ئـەوان زۆر تـوڕە ببـو بـەقایم لـە دەرگایـدا دەرگایـان کـردەوە لـە گـەڵ سـەلام کـردن گـووتی بـاوکم ئامـادە بکـەن لەگەڵ خۆم دەیبەمەوە. براکەی گوتی ئەوە تۆ چی دەڵی (ع) !

(ع) گووتی هەر ئەوەی بیستت .

براکەی گوتی لەبەر چی باوکم هێشتا (٢٤) کات ژمێرە لەلامانە!

(ع) گووتی ئەمرۆ بیبەمەوە باشترە نەوەك بەیانی تۆش بیبەیتە لای براکەی ترمان

براکەی گووتی من پێش نیارێکم هەیە بیبە بۆ ماڵی خوشکمان ( )

(ع) گووتی ئەگەر ئێوە دەسەلأتتان نەبێ بەسەر خێزانەکانتان باشە چۆن خوشکەکانتان دەتوانن پیاوەکانیان ڕازیبکەن ها.! من ئەو کارە ناکەم باوکم دەبەمەوە لای خۆم هەر بەخۆم بەخێوی دەکەم و ئاگاداری دەبم برام باوکم ئەرکی ئەوەندەی لەسەرمانە پاداشتی هەندێك لە چاکەکان بدەینەوە وایە یان نا برا گیان باوکمان لەسەرەتاوە هەر وانەبوە هەمووتەمەنی خۆی لەپێناو ئێمە دانا.

(ع) باوکی بردەوە لەگەڵ خۆی. وازی لەخوێندن هێناو هەموو کاتی بۆ باوکی تەرخان کرد. باوکی تەواو بێزەوەر ببو ڕۆژانە چەند جارێك پاکی دەکردەوە جلەکانی دەگۆڕی وسەری دەشوشت وخواردنی بۆئامادە دەکردو لەدەمی دەنا. لەمندالّی ساوا زۆر بەئەرکتربوو. براکانی بەچەند مانگ ئەگەر بهاتبان بۆ دیدەنی . بەلأم خوشکەکانی هەفتەی یەکێکیان دەهاتن یارمەتیان دەداو نانیان بۆ دەکردن. زۆرجار پێیان دەگوت بۆخۆت ژن بێنە یارمەتیت دەدات کارەکانت هەندێك لەسەر کەم دەکاتەوە ، (ع) دەیگوت ژن ناهێنم چونکە ڕۆژێك دادێت بێزاری دەردەبڕێ بەرانبەر باوکم منیش هیچ کات بەوە ڕازی نابم .لەیادمە ڕۆژێك نەخۆش کەوتم ئەوکات مندالّ بوم تەمەنم هەشت سالأن بوو باوکم منی لەباوەش گرتوو چەند جێگای بەمنکرد بۆچارەسەرم . دکتۆر و چاك ومەلا..هتد.تا چاك بومەوە ، بەوجۆرە باوکی خزمەت کرد شەش سالّی تەواو

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ صدق الله العظيم

﴿ الروم ﴾

واتا {خوا ئەو زاتەیە کەئێوەی بەلاوازی دروستکردوە(لەسەرەتانوتفەیەکی لاوان،دوای وەك دیل لەسکی دایکدا، هەرلاوازیت) لەوەودوا لەسەردەمی(لاویەتیدا،خوا) هێزودەسەلاتێك دەبەخشێت،دوای هێزوتوانا نۆرەی لاوازی وپیری دێت،هەرچی بوێت دروستی دەکات،بێگومان ئەو(پەروەردگارە)زۆر زاناو زۆر بەتوانایە}ت.ئاسان.



## بابەتی دووەم
# بۆچی گەڕاینەوە بۆ سەردەمی نەزانی

## (لماذا رجعنا الى عصر الجاهلية)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

يَـٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٧﴾ صدق الله العظيم

﴿الاعراف﴾

**واتا: {ئەی نەوەی ئادەم: شەیتان،ئێوەش لەخشتەنەبات هەروەك باوانتانی لەخشتە بردو لەبەهەشتدا بەدەرکردنی دان، خۆی دەستی کردبە داماڵینی پۆشاکەکانیان تاعەیب وعاریان پیشانی یەکتر بدات،بێگومان شەیتان ودارودەستەی،ئێوە دەبینن، بەڵام ئێوە ئەوان نابینن، جادڵنیابن کەئێمە شەیتانەکانمان کردوە بەیارو یاوەری ئەوانەی کەباوەڕ ناهێنن}ت.ئاسان**

**لەبەر چی گەڕاینەوە سەردەمی نەزانی؟ چیە ئەوەی وای لێکردووین بەرە بەرە بەرگی حەیاو شەرم دانین و پەردەی خۆشەویستی بەینی خۆمان وخوای گەورە بپچڕێنین،دەزانین ڕێگایەکی چەوتە بەڵام فریوی هاوڕێی خراپ و بنەمایەکی ناتەواو وکەناڵی خراپ و..هتد،**

**فریودانی شەیتان وورده بەووردەیە لەسەرەتا بەهۆی هاوڕێی خراپ و نزیك وباوەڕپێکراو توش دێ یت. کاتێك دەڵیت تۆبەڕاستی زۆر جوانی چۆن تەمەنی گەنجیت بەفیڕۆ دەدەیت ئەوکاتانەی دەڕوات دووبارە نابێتەوە.ئەو لەچکە**

داکەنە ئەو قژە جوانەت بۆداپۆشیوە ئەم قەدو بالآیەت هەر لەو جلە جوانانە دێت ئەم جوبەیە چیە لەبەرتکردوە .درۆیەکی بچووك هیچ نیە تەماشا کردن و نەزەر چیە تۆگەنجی وابکە و وابکە هەڵەی بچووکە گەورە دەبێت کاتێك بەئاگادییت کەکاتەکە بەسەر چووە و هەلی چاکردنەوەی هەڵەکان نەماوە!. باس کردنی ئەو بابەتە زۆر دڵم تەنگ دەکات .کاتێك دەبینم زۆر لەگەنجەکانی ئەوسەردەمە فریوی دەستی شەیتان بوونە زۆر بەداخم .

ئەنەس کوڕی مالیك ڕەزای خوای لێبێی لەپێغەمبەرەوە صلی لله علیەوسلم بۆمان دەگێڕێتەوە کەدەفەرموێ(لەنیشانەکانی نزیکبوونەوەی ڕۆژی دوایی زانست وزانیاری نامێنێ نەزانی دەردەکەوێت.زیناو داوێن پیسی بڵاو دەبێتەوە مەیی بەئاشکرای دەخورێتەوە ژنان ژمارەیان زیاتر دەبێت لەپیاوان تاوای لێدێت بەپەنجا ژن یەك سەرپەرشت کاریان دەبێت)صحیح مسلم ص٩٢١ هەمووومان دەزانین سەردەمی نەزانی چۆن بوو بەڵام ئیستا دوای ئەوهەموو پێشکەوتنەی کە ڕۆژانە بەچاوانی خۆمان دەیبینین لە تەکنەلوجیا: لەئامێرەکان لە بیناکان لە...هتد !.

ئەگەر بەوردی باسی ئەم هەموو ئامێرو داهاتانە بکەین چەند لاپەڕەیەکی دەوێ. باسەکەی ئێمە دەربارەی ئەوانە نیە تەنها دەڵێم دوای ئەم هەموو ئاسان کاریە بۆچی گەراینەوە بەڕفتارو کردارمان بۆ دواوە بۆ؟هیچ کات پێشکەوتنی نەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) لە ڕووتی و نەفامی و نەزانی و درۆ و رق وکین هەڵگرتن بەرامبەر یەکتری و حەسودی و خیانەت کردن نەبووە و نابی. لەنێوان مرۆڤەکان بەتایبەتی ئەوانەی لەناسنامەیان نوسراوە(مسلم)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ صدق الله العظيم ﴿الحجر﴾

واتا {ئیبلیس(بەبوغزوكینەو حەسادەتەوە) ووتی :پەروەردگارا، مادام بەهۆی(ئینسانەوە)منت سەرلێشێواوكرد، شەرت بێ لەزەویدا (هەموو گوناه ولادان وتاوانێكیان)لاجوان وشیرین بكەم وهەمویان سەرلێشێواو سەرگەردان بكەم،} {جگە لەبەندە دڵسۆزەكانی خۆت نەبێ (چونكە دڵیان بەباوەڕبەتۆ ویادی تۆ ئاوەدانە، هەوڵ و كۆششی من بۆ وێڵكردنیان ئاكامە}ت،ئا.

ئەگەر ئەوە قسەی شەیتان بێت بەخۆی دەڵێ من توانام نیە بەسەر ئەوانەی كەباوەڕی تەواو جێگیریان هەیە، بۆ ئێمە لەوانە نەبین، لەسەرەتاوە دەڵێم ئێمە ئامێریكمان لەماڵی خۆمان داناوە لەو٢٤ كاتژمێرەی شەوو ڕۆژمان نیوەی كاتەكانمان لەگەڵ ئەوبەسەر دەبەین ئەویش تەلەفیزێونە لەسەدا بیست ئەگەر كەناڵە بەسودەكان سەیركەین.ئایائەوانی تریش خرموو ناسیاوی ئێمەنین مۆدیلات و رەفتار و كرداری ناشایستەی لێهەڵدەگرنەوە،. من وەك ئافرەتێك كەدەچم بۆ بازاڕ بۆشت كرین هیچ كات ئەوشتومەكە ناكرم كەسەری والأبێت چونكە دوو دڵم لەپاك وخاوێنی . برای بەرێزم هەست بەچی دەكەی كاتێك دەستی خێزانەكەت گرتووە پانتۆڵێكی تەسكی لەبەر دایە یان تەنورەكەی تائەژنۆیەتی فەتحەیەكی سی سانتیمی لەدواوە كراوەتەوە پرچی بەرەلأكردوە.؟پرسیاریك بەرێزم ئایا؟ كەتەماشاكردنی و خۆ ڕازاندنەوەی وجوانی ولارولەنجەی خێزانت بۆ چاو تێركردنی هەندێك كەسی نەفس نزم بێت تۆ چیت بۆ ماوەتەوە كە شانازی پێوە بكەیت . كوا سەردەمی باو باپیرانمان چیلێهات بۆ وون بوو لەگەڵ هاتنی ئەو شەیتانە بۆ ماڵەكان بەوەش نەوەستاین

شتیی تریشمان بۆزیاد کرد ئەویش سەتەلایت وئەنتەرنێت ومۆبایل وهتد. .
ڕێز نەما تەبای نەما خۆشەویستی ناو خێزان لەبەین چوو من لەگەڵ ئەوە نیم کەهەرنەمێنێ چونکە کاری زۆرباشی پێدەکرێت بەلآم کارە خراپەکانی زیاترە،ئێستائەگەر هەرماڵیك تەلەفزێۆنی نەبێ پێیان دەڵێن دواکەوتوو،

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ صدق الله العظيم {الحجر}

واتا {جگە لەبەندە دڵسۆزەکانی خۆت نەبێ(چونکەدڵیان بەباوەڕ بەتۆ ویادی تۆ ئاوەدانە،هەوڵ وکۆششی من بۆ وێڵکردنیان ئاکامە}ت.ئاسان.
ئەم ئایەتە باسی باوەڕداران دەکات کەفریوی دەستی شەیتان نابن (چەند سەدساڵە ئەم ئایەتە بۆخۆشەویستمان دابەزیوە ،زیاتربیری لێ بکەینەوە وادەزانین ئەم ئایەتانە لەبەر ئێمەوبۆسەردەمی ئێمەدابەزیووە، پێغەمبەرمان دەفەرموێ(پەلەبکەن لەکاروو کردەوەی باش پێش ئەوەی چوونە نێیو تاریکی. دامێن گیرتان بێت کەوای لێدیت بڕوادار بەیانی بڕواداره ئێواره بێ بڕوا ئاینی خۆی بەکەمێك ماڵ وسامانی دونیا دەفرۆشێت) صحیح مسلم ص١٠١٨ لەکۆنەوە خەڵك رووت بوون هیچیان نەدەزانی دەربارەی ژیان وجلوبەرگ رەخنەیان لینەدەگیرا چونکە جلیان نەبوو ئەگەر بیان بوایە لەبەریان دەکرد،دەزانن ئەگەر ئێمە لەسەردەمی ئەوان ژیابایین چۆن دەبوین،وەئەگەر ئەوانەی سەردەمی نەزانی لەسەردەمی ئێمە ژیابونایە چیان دەکرد هەر بیریان لەڕوتی دەکردەوە یان بیریان لەبەرەو پێش وەچوون دەکردەوە(کەوا هەوڵی ئەوان ئێمەی گەیاندە ئەو ڕۆژە، بەلآم ئێستا لەبەر مۆدێلات نازانن چ لەبەربکەن بۆیە گەڕاینەوە بۆ ڕووتی وسەردەمی کۆن. ئافرەتێکی بەناو موسڵمان لەگەڵ

ئافرەتێکی غیرەدین ڕادەگرین لەلای یەك ئەوکات پرسیارێك لەخۆتان بکەن ؟ ئایا کامەیان خۆشەویستە لەلای خوداوخۆشەویستەکەی،ئایا؟ لەیەکترین جیادەکەیتەوە؟!هەروەها گەنجەکانمان چۆن جیا دەکرێنەوە لەغیرەدین؟ ئایا جیا دەکرێنەوە بەچی؟!بۆئەوان جلی وەك ئێمە لەبەرناکەن؟ هەر لەبەر ئەوەنیە کەوا ئەمە دەستووری خۆیانە. ئەی کوانی دەستووری ئێمەی موسڵمان چی لێهات بۆ گۆڕا؟بۆ بەسووك وئاسانی دەستورو عادات ورەوشت وکردارەکانتان دەگۆڕن!.

ئەبوو هوریرە لە.پێغەمبەر ﷺ دەگێڕێتەوە دەفەرموی (دووجۆر لە خەڵکی هەن دەچنە دۆزەخ کەنەمدیون:خەڵکانیك کەقامچیان پێیە هەر وەك کلکی مانگا لە خەڵکی دەدەن . دووەم ئافرەتانی کە پۆشاکیان لەبەر دایە بەلاّم ڕووتن قژیان وەك کۆپارەی حوشتر بەرزکردۆتەوە ئەوانە نەدەچنە بەهەشت نەبۆنیشی دەکەن لەکاتێك بۆنی ئەوەندەو ئەوەندە دەڕوات)صحیح مسلم

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

﴿ إِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ صدق الله العظيم ﴿الحجر﴾

واتا {بێگومان دۆزەخ شوێنی هەر هەموویانە}ت.ئاسان

ئازیزم ئەوەی تۆ بەباشی دەزانی لەڕاستیدا زۆر قێزەوەرە ئەگەر بەووردی وزیرەکی سەیری بکەی بڕوابکە ؟زۆران لەکوڕو کچانی موسڵمان بوون بەمەسیحی هەڵگەڕانەوە لەدینەپاکەکەمان بەهۆی هاوڕێی خراپ وکەناڵی خراپ وخێزان وکومەڵگای ناتێگەیشتوو. باوەشی موسڵمان هەردەم واڵایە بۆهەموو دیانەتێك کەدەگەڕی بەدوای ڕێگای ڕاست ، بەلاّم ئەگەر مەسیحیەك موسڵمان بێت بنەماڵەو کەس وکاری دەیکوژن لەبەرئەوەی بەدڵ وگیان پارێزگاری لەئاینەکەیان دەکەن، ڕوهبانیان زۆر توڕە دەبن ئەگەر بڵێن ماڵ ومنداڵت چۆنە؟دەڵێن جوێنمان پێی دەدەن ئێمە چۆن ژن دەهێنین وخێزان پێك دەێنین،

بەلأم نعوزوبلله. دەڵێن خوای گەورە خاوەن خێزانە دەڵێن عیسى کوڕی خوایە، ئێمە پێمان دەڵێن موسڵمان بەلأم هیچ ڕەفتارمان وکردارمان بەموسڵمان ناچێ ، چۆن موسوڵمان بەقسەیەك بەگۆرانیەك بەدرۆیك بەبچوکترین شت فریوو دەخوات ودەگۆرێت ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆجێگیر نەبوونی ئیمان لەدڵەکان، دەگەڕێتەوە بۆزاڵبوونی شەیتان بەسەربیروو باوەڕەکان .ئەگەر واباس دەکەم بۆخۆم نیە چونکە من ناچمەگۆڕی تۆ تۆش ناچیتەگۆڕەکەی من کردەوەی خۆم بۆ خۆم کردەوەی خۆت بۆ خۆت لەبیرمان نەچی خودای گەورە چی دەفەرموی

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

قُلْ إِنَّ ٱلْمَوْتَ ٱلَّذِى تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُۥ مُلَٰقِيكُمْ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ صدق الله العظيم

﴿الجمعة﴾

واتا: {پێ یان بڵێ ئەی پێغەمبەری خوا،بەڕاستی ئەومردنەی کەوا ڕادەکەن لەدەستی هەریەخەتان پێ دەگرێ لەوەو دوایش دەگەڕێنەوە بۆلای کەسێك کەزانایە بەنهێنی وئاشکرا، ئەوسا لەهەواڵ و(دەرئەنجامی)کارو کردەوەکانتان ئاگادارتان دەکات، (پاداشت بەرامبەر ئیمان وکرار دەبێت).}ت.ئاسان. بەرلەوەی ئەوکات بێت ئێستا ئەو پرسیارە با لەخۆمان بکەین چیمان کردوە لەو کاتانەی کەلە دەستمان چوە چیمان ئامادە کردوە بۆ داهاتومان قوتابی ژێر خۆی ماندوو دەکات بۆ گەیشتن بەنمرەی باش .لەکاتی وەرگرتنەوەی کارت و پلەی گەیشتنی دڵی زۆر بەخێرای لیدەدات .زۆر دڵخۆش دەبی کاتێك مامۆستاکەی ناوی بانگ دەکات فلأن دەرچوو بە نایابترین نمرە .مامۆستاکان شانازی بەم خوێندکارە دەکەن . ماندوبونێکی زۆر بۆ ناوداربون بۆڕێزلێنانی بنەماڵەکەت بۆژیانێکی خۆش بۆ خۆهەڵکێشان بۆ ..هتد ژیانی ئادەمیزاد

خوێندنەو دەرچونە بەڵام لەپۆلێك نیە بۆ پۆلێك بەڵكو دەرچونە بە نمرەی باش لەدونیا بۆ ئاخیرەت بۆبەهەشت یان بە نمرەی خراپ بۆ جەهەنەم خودا پەنامان بدا ،تا بتوانین با بەسەر بەرزی بژین و بەشانازیوو بەختەوەری بمرین.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ صدق الله العظيم ﴿الزمر﴾

واتا {دڵتان لای خودابێت وبگەڕێنەوەبۆلای پەروەردگارتان وتەسلیمی ئەو بن(لەهەمووژیانتان) پێش ئەوەی سزای خوا یەخەتان بگرێت لەوەودواش سەرکەوت ونابن وکەس نابێ بەرگریتان لێ بکات}ت. ئاسان.



# کچەکەی کۆلێژ

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلَّا مَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغَاوِينَ ﴿٤٢﴾

صدق الله العظيم ﴿الحجر﴾

**واتا: {بەڕاستی بەندە(چاك وپاكەكانی من)بەتۆ فریو نادرێن، وەتۆ دەسەڵاتت نیە بەسەریاندا، جگەلەوانەی كە سەركەش ویاخی وسەرگەردانن و(گوێ لەمستی تۆ دەبن)}ت،ئا.**

**لەساڵەكانی ٧٠ كچێك دەیخوێند لەكۆلێژ ناوی (س) بوو زۆر ژیر بوو هەمووساڵێك نمرەی بەرزی بەدەست دەهێنا هەر لەیەكی سەرەتای،مامۆستاكانی ڕێزیان لێدەگرتوو زۆریان خۆش دەویست زۆر جوان بوو بەڵام جوانی ئەم كچە كەس نەیدیبوو تەنها ماڵەوەیان نەبێ حیجابی لەبەر دەكردو ڕووپۆشی بەسەرەوەبوو تەنها دوو چاوەكانی دیاربوو . لەگەڵ خوێندكارانی هاوڕێی زۆر قسەخۆش بوو لەلای هەموان خۆشەویست بوو.**

**ڕۆژێكیان.(س)دەگەڕایەوە بۆماڵ لەڕێگا كوڕیكی توش بوو پێگوت دەتوانم قسەت لەگەڵ بكەم. س. ڕانەوەستا و ڕۆیی. ڕۆژی دوای دیسان هەمان گەنج هاتەوە سەر ڕێگای گوتی دەبێت قسەت لەگەڵ بكەم .س .گووتی چۆن لەسەر ڕێگام دەوەستی تۆ ئابروت نیە ئەویش گوتی تەنها دوو قسەم لایە دەمەوێت پێتی بڵێم .س گوتی قسەی چیت لایە زوو بیكەو بابڕۆم گەنجەكە لەناكاو گوتی(تۆم خۆشدەوێت) (س) زۆر بەم قسەیە دڵ پەست بوو هیچ ڕانەوەستا بەزووی ڕۆیشت.بەڵام ئەوەی ڕویدا سەیربوو گەنجەكە بۆجارێكی تر ڕیگای لەكچەكە گرتوو .گووتی من ناهێڵم تۆ بڕۆی تا گوێم بۆ نەگری من بەڕاستی تۆم خۆش دەوێ من نیەتی خراپم نیە دێم بۆ خوازبێنیت تەنها ئەگەر تۆ ڕازیبی،(س)گوتی تۆ گەلێك سەیری تۆ من ناناسی منت نەبینیوە چۆن وادەڵێی**

.گەنجەکە گووتی من ناوم(ح)دەرچوی کۆلێژم سێ ساڵە، ساڵی دوایم یەکەم ساڵی تۆبوو لەکۆلێژ بۆیە یەکتریمان نەناسی بەڵام من لەو کاتەوە ئاگاداری تۆم تۆ کچێکی زۆر بەڕێزو جوانی بۆیە ناتوانم دەرت بێنم لەدڵم.(س) گوتی چۆن زانیت جوانم من هەردەم سەرپۆشم لەسەرە هاوڕێکانیشم روخساری منیان نەبینیوە تۆ چوزانی لەژێر ئەم ڕوپۆشە روخسارێکی جوانم هەیە نابێت من لەبەر ئەوەی شێوەم ناشیرین و ناڕیك بێت ئاوام کردبێت و نەوەك لەبەر ترسی خودا خۆم پۆشیوە (ح)گوتی ئەوەی من بزانم روخسارت وەك مانگ جوانە هیچ لەوە دوو دڵ نیم لەچاوە جوانەکانت ئەوە دەبینم ئەو چاوە گەش وجوانانە بڕواناکەم درۆ بزانن وانیە؟(س)کە ئەوەی بیست هەوموو گیانی هاتە لەرزین و گووتی ناونیشانی خۆتم بدەیی بەیانی وەڵامت دەدەمەوە.(ح)کە گەڕایەوە بۆماڵ لەخۆشیان هەڵدەپەڕی وگۆرانی دەگوت، ئەو شەوە چاوەکانی نەچووە خەو هەر دەیگوت پاش ئەم هەموو چاوەڕوانیە وترسان ودڵە ڕاوکێی یە ونەوێرانم بۆقسە لەگەڵ کردنی تەنها چەند سعاتێك ماوە تا کۆتای بە ئازارەکانم بێت وە لەناخۆشی ڕزگارم دەبێت، بەیانی لەدەرگای ماڵی کوڕەکە درا دایکی دەرگای کردەوە گووتی (ح)کوڕم بانگت دەکەن .ئەویش بەڕاکردن خۆی گەیاندە لای دەرگە گەنجێکی دیت زەرفیکی نامەو کارتۆنیکی بچووکی لەدەست بوو گووتی تۆ فلانی(ح)گووتی بەڵی، ئەویش هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتی من برای(س)نم. فەرموو ئەمە خوشکم بۆی ناردوویی گووتی ئەمە وەڵامەکەمە .دوای ڕۆیشت .(ح)هاتە ژوور لە خۆشییان قاچەکانی هەڵێ نەدەگرتن واهەستی دەکرد دەفڕی . نامەکەو کارتۆنەکەی لەبەرامبەر خۆی دانابوو لەسەر مێزیك هەر چەند دڵی نەدەهات بیکاتەوە لەدڵی خۆیدا دەیگووت دەترسم ڕازی نەبێ ؟ ئەگەر نوسرابوو ڕازیم ؟بۆدڵم خورتە خورت دەکات ؟ئەی براکەی بۆ واحادز وغەمبار دیاربوو؟ چەندەها بۆچونی بۆهات چەند کاتژمێرێك بەدیاریەوە دانیشت. دوای نامەکەی کردەوە نوسراوە(بسم اللەالرحمان

الـرحيم)لەکەسـێك کـەغافڵ بـوو لـەخودا چـەند سـاڵێك. بـۆ بەئاگاهێنـەرم ومامۆسـتام.! سوپاسـت دەکـەم بـۆ ئـەو کـارە باشـەی تـۆ لەگـەڵ منـت کـرد ئەوکارەی تۆ تەنها من دەزانم چەندە بەنرخە کە ناتوانم پاداشتەکەت بدەمەوە هەر خودای گەورە خۆی پاداشتت بداتەوە. من ئەو نامەی کەبۆتۆم ناردووە پێش ئەوەی بگاتە دەستت ئەندامانی خێزانەکەم خوێندویەتیانەوە .چونکە ئەو کـارەی مـن پێـی هەڵدەسـتم پەیوەنـدی بـەتۆوە نیـە بـەڵکو تـۆ تـەنها ئاگـادار کەرەوەیـەك بـووی کـە خـودا بـۆمی نـارد تـۆ عاشـقی چاوەکانم بـوی واتـە مـن تاوانیکم کردیەو لی بیٚ ئاگـام تۆخەبەرت کردمەوە . ئاخ بۆمن چەندان کەسـی تـریش چـاوی منیـان پێـی جـوان بـووە بـەلاّم دەنگیـان نـەکردوە مـن هەڵـە بـووم دەبوایە چۆن بالاّم پۆشی چاویشم داپۆشیبا(ح)تۆ موعجیـب بوی بەچاوەکانم فەرمووئەوەش چاوە کانم).

لەوکاتە. (ح) زوو سەیری ناو کارتونەکەی کرد هەردوو چاوەکانی(س)تێدابوو پڕبەدەنگی هـاواری کـرد (نـا شـتی وانـابی)ئەوانی مـاڵی هـەموو ڕایـان کـرد.(ح) چـیبوە هیـچی پێنـەگوترا ڕایکـرد بـەرەو مـاڵی(س)گەیـشتە سـەری کـۆلاّن قەرەباڵغی دیـت نزیـك بـۆوە دیـتی خـەریکن تـەرمی.(س)دەخەنـە نـاو سـەیارە. کەوتـە سـەر زەوی بـاوك و بـرای. (س) هـەڵیان گـرت لەگـەڵخۆیان بردیـان بـۆ گۆڕستان ، کەبەهۆش خۆی هاتەوە دیتی ناشتویانە دەگریاو بەهەردوو دەستی لەسـەری خـۆی دەدا دەیگـوت مـن کوشـتم سـزام بـدەن مـن تـاوان بـارم بمکوژن.خەڵکەکە هەموی ڕۆیشتن دەیانگووت وەرە لەگەڵمان دەیگوت جێم بێڵن باتـەنهابم دوو ڕۆژوو دوو شـەو گۆڕەکـەی جێنەهێـشت وهـەر دەگریـاو هـاواری دەکرد.لەپڕیك یەکیك دەستی لەسەر شانی داناو گووتی هەستەوە؟ سەری بڵنـد کرد پیاوێکی بینی گووتی من باوکی((س))من لەخەو ئەوم بینی لەجێگایـەکی زۆر خۆش بوو پێگووتم سەیرکە جێگام چەندە خۆشە گووتی سوپاسی (ح)بکـە مـن لەبـەر ئـەو کـردارەی ئـەوکردی لەگـەڵم ئـەم جێگایـە خۆشـەم بەنسیب بـوو

پێبلّی هێچی تر هاوار نەکات ونەگریی. کەمێك دانیشت فرمێسکەکانی سڕیوو گووتی استغفرالله قەت ناتوانم لەبیری بکەم بەلاّم بەلّین دەدەم لەسەر گۆرەکەت کەتا ماوم سەرم بلّند نەکەم خۆم وەك تۆ خاوێن وپاك ڕابگرم نەزەر نەکەم .
ئەوەی (س)کردی بەلای ئیوە چۆنە لەو بڕوایە دام هەندێکتان دەلّێن شێتیە !
هەندێکی تر دەلّێن جیهادە لەپێناوی خودا لەکاتیك ئەم شتە زۆر دەگمەنە!
ئەوەی منیش بۆی دەچم هەستکردنی(س)بەشەرمەزاری بەرامبەر خالقی چونکە بەجۆریك خۆشی دەویست کە کەم کەس هەیە لەومانایە تێبگات .
بۆچی لاتان سەیر نیە ئەگەر ببیستن یەکێك خۆی کوشتوە لەبەر نەبونی مالّ وقەرز داری لەکاتێك عەبدی سامانە، یان کچێك خۆی دەسوتێنی لەبەر پەیوەندیەکی دۆڕاوو.
(عن ابی هریره.ﷺ ،قال|قال رسول الله.ﷺ.الدنیا سجن المومن وجنه الکافر)
صدق رسول الله
ابوهریرە.لەپێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕیتەوە دەفەرموی(دونیا بەندینخانەی بڕوادارە و بەهەشتی بێباوەڕانە) راستی فەرموە پێغەمبەری خودا.



# دوو براکە بۆ وایان لێهات

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ صدق الله العظيم ﴿ الشورى ﴾

واتـا: {هـەر خـوا خـۆی پەشـیمانی وتۆبـەی بەنـدەکانی وەردەگرێـت ،هـەروەها چاوپۆشـی دەکـات لەهەڵەوگوناهـەکانیان، وەبەوکاروکردەوانـەش کەئـەنجامی دەدەن دەزانێت وبەئاگایە}ت.ئاسان.

ئەو دووبرایە زۆر هۆگری یەکبوون لـەلای یـەك زۆر بـەڕێز بـوون لەهـەموو کۆڕوو دانیـشتن و سـەردان و ڕوداویـك بەیەکـەوە دیـاربوون. کارگەیـەکیان هـەبوو بەیەکەوە کاریان تیادا دەکرد هەموو خزموو ناسیاوێك وجیرانـەکان حەسودیان پێدەبردن. هەردوکیان خاوەن خێزان و مـاڵ و منـداڵ بـوون لـە یـەکێك لەگەڕەکە خۆشـەکانی نزیـك بـازاڕ دووخـانوی گـەورەیان دروسـت کردبـوو هـەروەك یـەك . هـیچ کـات بـێ یـەکتر نەیانـدەتوانی، ئێوارەیـەك بەیەکـەوە دانیـشتبون منداڵـە بـچوکەکان یاریـان دەکـرد گـەورەکانیش بەیەکـەوە دەیـان خوێنـد، براگەورەکـە گووتی: بۆکچەکەت بەکوڕەکەم نادەی ئەویش گووتی بێ ئەوەی تۆ باسی بکەی من وام دانابوو بەڵام دوام خستبوو تاخوێندنیان تـەواو دەکـەن. دوای ماوەیـەك ئەوبڕیارەی براکان لەسەری ڕێك کەوتبون بەمنداڵەکانیان ڕاگەیاند .

کوڕی برای گەورە ناوی(و)بوو تەمەنی( ١٨)ساڵ بوو.

کچەکەش ناوی(ن)بوو تەمەنی (١٦)ساڵ بوو.

ئەوانیش ڕەزامەندی خۆیان نیشاندا. دوای چەند ڕۆژێك لە ئاهەنگێکی خێزانی گەورەبەئامادە بوونی خـزم و ناسیارو وهـاوڕێ یـانی هـەموو لا ،کـوڕە وکچەیان لەیەکترمارەکرد. ڕۆژەکان دەڕۆیشتن خۆشەویستی هەردوو بنەماڵە زیاتر دەبوو

بۆیەکتری، پاش دووساڵ لەمارەبڕینی (و)لەگەڵ(ن). ڕۆژێك برای گەورە بەبرا بچوکەکەی گووت تاکەی ئەم دووانە ڕابگرین وبەیەکیان شاد نەکەین؟ ئەویش گووتی بەڵام ئێمە گوتمان دوای خوێندنیان ڕاستە کوڕەکەی تۆ خوێندنی تەواو کرد ئەی نابێ کچەکەی منیش خوێندن تەواو بکات باوکی(و)گووتی تۆ زۆر سەیری باخوێندنەکەی تەواو بکات لەماڵی ئێمە جیاوازی هەیە ماڵی من وماڵی تۆ. ئەویش گووتی برا گیان تا قسەی تۆ دەشکێنم ملی شەیتان دەشکێنم چۆنت پێ باشە با وابێ.

لەسەر ئەوە ڕێکەوتن کاتەکەیان دەست نیشان کرد هەردوولا ئاهەنگیان بۆڕێك بخەن. هەمویان سەرقاڵ بوون خۆیان ئامادە دەکرد بۆئاهەنگەکە ڕۆژ هەروەك سعات تێپەڕدەبوو. بووبەڕۆژی چوارشەمە کەدەکا دووڕۆژ ماوە بۆ ئاهەنگەکە. بووك وزاوا لەگەڵ پووریان چوون بۆ بازاڕ تا جلی بوکێنی بێنن ،لەبازاڕ پوریان هەندێك وردەواڵەی بەبیر هاتەوە کەدەبێ بیان کڕێت ،بۆیە ئەوان گەڕانەوە بۆماڵ کاتێك هاتنەوە کەس لەماڵ نەبوو هەریەك بۆلایك چوبون ئەوەی بۆ لای خەیات ئەوەی بۆ کەلوپەلی چێشت لینان ئەوەی چووبوو بۆ لای حەلاق ئەوەی چوبوو بۆ بازاڕ کەس لەماڵ نەمابوو(و)بە(ن)ی گووت بۆناچی جلەکانی بوکێنی کە هێنامان لەبەری بکەی بزانین چۆنە بۆت؟ئەویش چوو لەبەری کرد دەتگوت پەپولەیە باڵی بۆ لکاوە لەوکاتە (ن) زۆر جوانتر هاتەبەر چاوی (و)هەروەك* پێغەمبەر ﷺ.دەفەرموی دووکەس لەشوێنیك بن ئیلا شەیتان سێ هەمیانە*لە (ن)هاتە پێش وگووتی تۆ زۆر جوانی تائێستابەم جۆرەبەوردیسەیرم نەکردوی. ئەویش گەڕاوە دواوە گووتی دورکەوە (و)گووتی تۆ ئامۆزاو خۆشەویست و دەزگیران و مارەبڕی منی دوو ڕۆژی تریش ئەو دوریە نامێنی.شەیتان دڵی هەردوکیانی بۆ لای یەکتر ڕاکێشا کارێکی ناشایستەی پێکردن کەنەدەبوو بەهیچ جۆرێك ببێت .

ئەوکارەیان لای کەس باس نەکرد بەنهێنی لای خۆیان هڵگرت. هەڵەنەکریت باشترە چونکە چاککردنەوەی زۆر زەحمەتە. ڕۆژی گواستنەوەیە هەموو کەس وکارو خزم وناسیاو هاتوون. لەهەموولایەك پیرۆزبای وشایی وچەپڵە لیدانە. چەشت لێنانە شیرینی گێڕانە! بەڵام بووك وزاوا زۆر دڵتەنگ بوون بەو کارە هەڵەیەی کە کردبویان دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕۆژە.بووکیان برد بۆ ئارایشگا.

دوای چەند کاتژمێریك هەموو ئامادەبوون بچن بەدوای بووك لەئارایشگا بیهێننەوە(و)خەریك بوو بڕوات لەوکاتە دەنگی (موسەجیلەکە)نەما کەلەسەر دیوارەکە دایان نابوو گووتی دەچم بزانم چیبوو هاوڕێ یەکانی گووتیان ئێمەدەچین گووتی هەربەخۆم شارەزاترم بەماڵی خۆم من دەچم؟!بەڕاکردن چوو بۆ ژوور ئەوانیش لەبەر دەرگا چاوەڕێیان دەکرد.بەینێکی پێچوو نەهات بانگیان کرد زووکە چیت کردبۆ دواکەوتی کردیان بەپێکەنین گووتیان خەوتوی بێین خەبەرت بکەینەوە. نەهاتەوە نەدەنگی موسەجیلەکەش گەڕایەوە. چوون بۆ ژوور سەیر دەکەن کارەبا لیی داوە لەسەر زەوی کەوتووە بانگیان کرد بەڵام ئەوگیانی لەدەست دابوو (مردبوو) کەس بەخەیاڵیشی دانەدەهات ئەوەڕوودات بەڵام خودای گەورە دەفەرمووی. کاتێك هەجەل هات نەسعاتیك دوا دەکەوی ونەپێش دەکەوی)ڕاستی فەرموە پەروەردگار. (و)کارەبا کوشتی . بەیەك چاوتروکان خۆشی و شادی بوو بە شین وگریان.بەڵام لەهەموو کەسێك زیاتر کەهەستی بەدڵتەنگی ودڵ توندی دەکرد (ن)بوو کەزۆر دەگریا تا دەبورایەوە.چونکە ئەوەی کەئەو دەیزانی کەس نەیدەزانی سێ مانگ دوای مردنی(و) (ن)زۆرنەخۆش کەوت بردیان بۆ لای دکتۆر:دوای تاقیگەو پشکنین دەرچوو کە(حامیلەیە)د.گووتی زگی هەیە. هەردووبنەماڵە دانیشتن بۆئەوەی لەسەرئەم بابەتە نوێیە بدوێن(ن)گووتی ئەمە لەو ڕۆژە رویدا کەچوین جلکی بوکێنیمان هێنا ئەوە ڕاستیەکەیە . مامی گووتی چۆن بڕوابکەم کێ دەڵی کوڕی من ڕاستی تۆی نەزانیوە کەتۆناپاك بووی شایستەی ئەوە نەبوی ببی

بەهاوسەری لەبەرئەوە خۆی نەکوشتوە ئێمەی بێ ئەقڵیش هەر لەسەر ئەو خەیاڵەین کەوا کارەبا گرتویەتی !.(ن)چوو قورئانی هێنا دەستی پێدادا گووتی ئەم خودایەی لەسەر سەرمانە دەزانی ئەو منداڵە حەرام نیە منداڵی(و)وە .بەلام ئەو قسانە هیچی فایدەی نەبوو . کارەکە لەدەمەقاڵی دەرچوو بوو بەشەڕوهەرا. تاوای لێهات خەڵکیان کەوتە بەین(ڕاستە ئەومنداڵە حەرام نیە بەلأم نەعادات و نەکۆمەڵگا ئەوکارەپەسند ناکەن) یەك دووڕۆژێکی پێچووکات درەنگی شەوبوو لەگەڵ هاواری (ن)هەموو بەخەبەر هاتن سەیر دەکەن لەحەمامەکە دەرگای لەسەر خۆی قایم کردوەو ئاگری لەخۆی بەرداوە هەتا دەرگایان شکاند وکوژاندیانەوە لەرێگای نەخۆشخانە گیانی لەدەست دا. لەوکاتەوە دوو براکە ئەوهەموو خۆشەویستیەی کەهەیانبوو بۆیەکتری هەمووی بووبە دوژمنداری ورق وکینێ.هەردوکیان خانویان فرۆشت هەریەك بۆلایەك ڕۆیشتن.

بۆیە دەڵیم ئەوەی ڕوو دەدات لەم دونیایە هەمووی دەگەرێتەوە بۆ کەم ئیمانی و گوێ پێنەدان ونەفس نزمی بۆشتی کەم بایەخ کەهەمومان دەزانین کەواهەڵەیە لەکاتێکی ناسك ڕوو دەدات،بەلأم هەردەم شەیتان بەنەفرەت کەن نەیەڵن هیچ کات هەڵەکان گەورە بن بتانگەیەنێ بەکۆتایی ڕێگا چارەسەری نەبێ. بۆیە لەبیرنەکەین شەیتان هەموو هەوڵێکی خۆی دەدات بۆلەناوبردنی ئیمانداران. ئێمەش بابەهەموو توانایەکمان هەوڵبدەین پیلانەکانی لەناوببەین بەخۆڕاگرتنمان لەهەموو هەواو نەفسێك لەنەهامەتی و بەلأکانی ژیان. دەبا لەئیستاوە بەڵینمان نوێ بکەینەوە بۆ بەرنگاربونەوەی ئەم دوژمنە نادیارە .

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّـٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ صدق الله العظيم ﴿ النحل ﴾

**واتا: {خۆئەگەرتۆ زۆر مەبەستت بێ ئەوانە هیدایەت بدەی، خوائەو کەسانە هیدایەت نادات کە سوورن لەسەر گومڕایی، ئەوانە(لەقیامەتدا)هیچ جۆرە پشتیوانێکیان نیە}ت.ئاسان.**



# خوێندكارێك لە هەندەران

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ صدق الله العظيم ﴿يوسف﴾

واتا {بەڕاستی لەسەرگوزشتەو بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری هەیەبۆ كەسانی ژیروهۆشمەند، وەنەبێ قسەوباسی دەست هەڵبەست بێ، لەلایەن كتێبە پێشووەكانەوە (وەك تەورات وئینجیل) پەسندكراوە، وەڕوونكردنەوەی هەمووشتێكی تیا دیاریكراوە، وەهیدایەت ورێنموویی ورەحمەتە بۆكەسانێ كەباوەڕ دەهێنن} ت.ئاسان

گەنجێك بەناوی(هـ) بۆتەواو كردنی خوێندنی ڕووی لەدەرەوەی نیشتیمان كرد.زۆر لەتێكەڵ بوون بەخەڵك دەترسادەیگووت توشی گوناه دێم ،گەنجێكی خۆپاریز بوو لەكوناح بەهەموو جۆرێك. لەكۆلێژێكی ئەمریكی دەیخوێند.خوێندكارەكانی ئەم كۆلێژە زۆر سەرسام ببون بەزیرەكی و لێهاتووی وخۆبەدوورگرتنی لەهەموو كێشەیەك. زۆرهەوڵیان دەدا لێی نزیك ببنەوە بەڵام ئەو تابیتوانیبا تێكەڵ بەئەوان نەدەبوو .كچێك كەزۆر زۆر جوان بوومۆعجیب بوویێ هەوڵیدەدا سەرنجی ڕابكێشێ بوولای خۆی.(هـ)دەیزانی بەڵام خۆی وانیشان دەداكەهیچ ئاگادارنیە هەردەم زیاتر دووردەكەوتەوە.لەگەڵی دادەنیشت دەیگووت(هـ) تۆبۆ وەك گەنجانیتر نیت بۆ دووردەكەویەوە هەردەم؟بۆسەیرم ناكەی كاتێك لەگەڵت دەدویم ؟(هـ)دەیگووت من موسڵمانم دابوونەریتم جیاوازە ئاینم لەسەرم واجبدەكات خۆم بپارێزم لەتێكەڵبون وكوناح.

هەوڵەکانی ئەم کچە هەمووی بێسودبوو. ڕۆژێکیان (ه)لەژوورەکەی خەریکی خوێندن بوو. کەوا لەگەڵ چەند قووتابییەکی تر شوقەیەکیان گرتبوو ،ئەوان هاتن بۆ لای گوتیان ئەو هەموو خوێندنەی تۆ بوو بەچی وەرە باهەندێك بچینە دەرەوە هەواکەی زۆر خۆشە بەفردەبارێت چەند ساڵێك جارێك بەفربارین نابینین لەووڵاتی خۆمان، ئەویش گوتی ئێوە بڕۆن من نایەم ،کەئەوان ڕۆیشتن کەمێکی پێ چوو لەدەرگا درا، چوو دەرگای کردەوە کچەکەی هاوڕێی خوێندنی دیت هاتووە.گووتی چۆنە هاتووی بۆ ئێرە؟کچەکە گووتی ئەمڕۆ خۆت دەزانی پشووە هاتم تابەیەکەوە بخوێنین (ه)گووتی ناتوانم ببورە.
کچەکە: بۆ هیچی تیایە بەیەکەوە بخوینین؟
(ه)گووتی من تەنهام کەس لێرە نیە بۆیە تۆناتوانی بیتە ژووری دەبێ بڕۆیی!
کچەکە ئەوەی بەهەل زانی گووتی هیچی تیانیە گەر بێمە ژوور بەیەکەوە دەخوێنین. پاڵێکی بە(ه)وەنا بەزۆر هاتە ژوور! ئەو کات (ه)چووە دەرەوە لەبەر دەرگا راوەستا گووتی بەڵکوو هاوڕیەکانی ژوورم بێنەوە. کچەکە بە زۆر رایکێشا ژوورەوە گووتی تۆ لەمن دەترسی کاتێ دەبوایە من لەبەر تۆ ڕام بکردایە!
زۆرداوای لێکرد کەبڕوات .ئەو هەرگوێ پێنەدا:
لەبەردەمی دەهاتوو دەچوو قسەی خۆشی بۆ دەکرد بەلاّم (ه)سەری بڵند نەدەکردوو سەیری نەدەکرد.بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی سەرنجی بۆلای خۆی رابکێشی گووتی ژوورەکە زۆر گەرمە.چاکێتەکەی داکەند لەتەنیشتی دانیشت (ه)هەڵسایەوە گووتی تووشی گوناهم مەکە تکات لێدەکەم بڕۆ، زۆر تووڕە ببوو قۆڵی گرت هەتا لای دەرگاکەی بردوو دەرگای بۆکردەوەو چاکیتەکەی دادەستی گووتی بڕۆ. بڕۆ یان من دەڕۆم؟ کچەکە پاڵێکی تری بێوەنا ووتی:باشەتۆ خۆت بەچی دادەنی خۆت گران دەکەی وادەزانی گەنجانی وەك تۆ ناناسم من دەمەوی ببین بەهاوڕێ ودۆست ئەو هاتوو هاوارەی ناوێت ئیستا کاتەکە گونجاوە

بۆیەکتر ناسین وئاشنابوون بۆ ئەوەندە سەیری من خۆم داوات لێدەکەم . هەردەچووە پێش ئەویش هەردەچووە دواوە. تاگەیشتە دیوارەکە.کچەکە گووتی مەجالی ڕاکردنت نەماوە دەچی بۆکوێ من لەو ڕۆژەی تۆم دیتوە دڵم لەلام نەماوە دووساڵە بەهیوای ڕۆژیکی ئاوام ئێستا پێم بڵی چۆن من دەبینی؟هەر وەك ئەوەی من دەتبینم . (ه)گووتی تۆ وەك شەیتان دەبینم کەدەیەوی لەناوم ببات . هیتەرە کارەباییەکە بەقەد دیوارەکە هەڵواسرابوو دەستی خستە سەری بەتوندی . قرچە قرچی لێوەهات ودەستی بەسەختی سووتا.

کچەکە هاواری کرد وامەکە بۆ واتکرد تۆشێتی . تۆشێتی!

(ه)ئەو سوتانە چەند ڕۆژیکی تر چاکدەبێتەوە. من بەرگەی سوتانی دوا ڕۆژناگرم ئەگەر بەگوێ تۆ بکەم تووشی زینا وگوناە دیم بەوکارەشم ڕوو ڕەشی لای خودای گەورە دەبم .

کچەکە گووتی چۆن دینیکە ئەوە کەسوتانەکەت پێ باشتر بێت لەو خۆشی وڕابواردنەی کەمن پێم دەدای ها؟!

(ه)ئیمانمان فێرەی ڕەوشت بەرزی وکرداری ڕێك و وەفاداریمان دەکات وەئاگامان لە ناموسی خەڵك بێت بەناموسی خۆمانی بزانین .کچەکە گووتی حەزدەکەم هەندێ باسی ئاینەکەی خۆتم بۆبکەی بەودینەت ئاشنام بکەی.ئەگەر ئەمڕۆ ناتوانی ومانەدی ڕۆژێکی تردێمەوە من داوای لێبوردنت لێدەکەم لەوەی کە ڕوویدا،(ه)من ماندی نیم زۆرش بەپەرۆشم تا بۆتی باس بکەم.

دووسعات دانیشت باسی ئاینی پیرۆزی بۆکرد(ه).بۆ ئەمڕۆ ئەوەندە بەسە، کچەکە: بەلأم بێزار نەبوومە(ه)،هەرچەند بەردەوام بین ئاشناتردەبیت بەلأم بۆ ئەمڕۆ ئەوەندە بەسە،.

کچەکە:ئێوە ئاینێکی پیرۆزتان هەیە کەماف بۆ هەمووشتێك داناوە.

(ه).لەقورئانی پیرۆزسورەتیکی تەواوخودای گەورە بەناوی ئافرەتی کردوە کەهیچ سورەتی بەناوی پیاو دانەبەزاندوە ئەوەش ڕێزیکی ترە بۆئێوەی ئافرەت.

بەیانی کەلەخوێندنگا دیتی دووبارە داوای لێکرد باسی پێغەمبەر ﷺ. بۆبکات رۆژ دوای ڕۆژ زیاتر هەولی دەدا فێربێت (ه)گووتی!. رۆژێك پرسیارێکی زۆرسەیری لێکردم .گووتی لەکەنالە ئاسمانیەکان وولاتە موسڵمانەکان دەبینم بەلاّم زۆربەیان وانین کەتۆباسی دەکەی قورئان بەزمانی ئێوە دابەزیوە ئەی چۆن پەیرەوی ناکەن بۆچی شەڕو فیتنەو ڕووتی هەرباوە لەناوتان؟! بێدەنگ بووم نەمتوانی وەلاّمی بدەمەوە. دەڵێت منیش هەمان پرسیارم لەخۆم کرد(وایە بۆئێمەی موسڵمان واین).رۆژێك سەیرم کرد ئەم کچە بە جلێکی بەرین ودرێژ ولەچکێکی جوان هاتە خوێندنگا گووتی من دەمەوی بێمە ڕیزی ئێوەی موسڵمان ئاینم ئاشکرابکەم بەهەمووخەڵك بڵێم من موسڵمانم گووتی(ه)گیان ئەگەر من ئیمان بهێنم تۆ منت خۆشدەویٚ.ئەویش گووتی ئەگەرلەبەرئەوە ئیمان دێنی ئەوکارە مەکە.کچەکە گووتی من لەبەرخۆشەویستی تۆ ئاشنابووم بەخۆشەویستی خالیقم وپێغەمبەرەکەی. دەمەوێ ببم بەهاوسەرت، خوێندنیان تەواو کرد پێش گەڕانەوەی بەچەند ڕۆژیك کچەکە هاتەلای گووتی من ناتوانم بیٚ تۆ بژیم وادەزانم خودای گەورە تەنها منی دروست کردوە بۆئەوەی ببم بەهاوسەرت یان تۆ دەبی لێرە بمێنیتەوە نەچێتەوە وولاّتەکەت یان دەبیٚ منیش لەگەڵ خۆت ببەی. ئەویش گووتی لەو بڕوایە دام لەشارەکەی خۆشم بگەڕێم کەسێك نادۆزمەوە وەك تۆبێت باش وئیماندار.

(ه)دەڵیٚ ئەو قورئانەی باوکم پێدام وئەو بەرماڵەی دایکم پێدام کاتێك چووم بۆ دەرەوە بۆ خوێندن لەگەڵ خێزانەکەم وشهادەکەم هێناوەو هاتمەوە بۆ وولاّتەکەم (ئێستا(ه)کچێك وکوڕێکی هەیە بەخۆشی دەژیی لەگەڵ خێزانەکەی

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ فِى ٱلْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ ٱلْوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ صدق الله العظيم ﴿ قصص ﴾

واتا {ئێمەش دەمانەوێت(دەروو بکەینەوە لە)چەوساوەکان ومنەتی خێربکەین بەسەر لاوازەکاندا لەسەر ڕووی زەویدا، وەدەمانەوێت بیانکەینە پێشەواو بیانکەینە جێنشین}ت.ئا،



# مامۆستای ئاین وکچەکانی

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ صدق الله العظيم ﴿ الزمر ﴾

واتـا: {(هــەوڵ بــدەن کەبــەردەوام)دڵتــان لای خوابێــت وبگەڕێنــەوە بــۆلای پەروەردگارتان وتەسلیمی ئەوبن، پێش ئەوەی کەسزای خوا یەخەتان بگرێت لەوەو دواش سەرکەوتوو نابن وکەس نابێ بەرگریتان لێبکات}ت.ئا،

لەساڵەکانی (١٩٨٦،١٩٨٥)لەقوتابخانەی (........)دوو خوشك لەگەڵماندابوون لـەم قوتابخانەیـە، یـەکێکیان دووی ناوەنـدی بـوو ئـەویتریان سـێ ناوەنـدی بـوو باوکیـان مامۆسـتای ئـاین بوو،بـەزمانی کـوردەواری خۆمـان(مـەلای مزگـەوت). تـائێرە باسـەکان ئاسـایین بـەڵام ئـەوەی نائاسـاییە ئەوەیـە! ئـەم دوو خوشـکە بەجلێکی جوانی پۆشتەی محەجەبە دەهاتن بۆ قوتابخانە بەڵام کەدەگەیشتن ئـەم جلانـەیان دادەکەنـد جلـی تریـان لەبـەر دەکـرد تـەنورەو قـەمیس بـەڵام بـەناڕێکی چـونکە جلــەکانیان زۆر ناڕێــك و تەســك وکــورت بــوو ڕەفتــەیان لەســەریان دەکردەوەوپرچیان بەڕەڵادەکرد. زۆر جار مامۆستاکان لێیـان دەپرسـین بۆچـی وادەکــەن بــەبێ ڕێــزی دەیــان گــووت بــۆ قەدەغەیــە!. مــن لــە قوتابخانــە هاتمەدەر،بـەڵام ئاگاداریـان بـووم ئـەوان لەسـەر ئـەو ڕەوشـتە ناڕێکـەیان هـەر بەردەوام بوون ئەویش درۆ کردن بوو لەگەڵ ماڵەوە دوای چەند سـاڵێك بـوون بـە مامۆستا ئەوکاتـە پـەردەی شـەرمیان لادرا هـەر لـە ماڵـەوە جلـی ناڕێکیـان لەبـەر دەکـرد باوکیـان زۆر داوای لێدەکردن کـەوا جلـی جـوان و ڕێـك لەبـەر بکـەن بـە باوکیان دەگووت تۆلەسەردەمی کۆن دەژی.ئەویش دەیـوت خـەڵك وانـاڵێ دەڵـێ

کچەکانی مەلا بە چ جۆرێك دەچنە دەرەوە من چۆن قسە بۆ خەڵك بکەم و ئامۆژگاریان بکەم کە خۆم ناتوانم ئامۆژگاری کچەکانم بکەم و چۆن بڕوام پێدەکەن و گوێم لێ ڕادەگرن کەوتاریان بۆ دەدەم کە دەچمە مزگەوت خەڵکەکە هەموو پێم پێدەکەنێ و گاڵتەم پێدەکەن . وامەکەن شەرم لەمن لەخەڵك ناکەن شەرم لەخوا بکەن پێم بڵێن ئێوە چ جۆرە مامۆستایەکن بەخۆتان لەماناى ژیان بەسەربەرزی وئیمانی پتەو رێزی باوك تێنەگەیشتوون چۆن منداڵەکان فێردەکەن . وایلێهات ژورێکی لابەلای بۆخۆی دروست کرد هیچ تواناو دەسەلاتی بەسەریان دانەما بۆیە دوورکەوتەوە لێیان. بەڵام پێشینان دەڵێن(دەمی خەڵك کونە دیوار نیە تۆپێ قوڕی پێدابدەی) دەیان گووت مامۆستا کچەکانت بۆئاوابەرەڵان بۆوادەکەن ؟ مامۆستا: بەگوێم ناکەن نصحەتم لەگوێ ناگرن گەورەبوونە دەسەڵاتم نماوە بەسەریان نازانم چیبکەم. خەڵکەکە:ئەوە چ قسەیەکە دەیکەی مانای چیە کارت بەسەریانەوە نیە.یەکێ دەیگووت کچی من بوانایە لێنەدەگەرم بچن بۆ دەوام .یەکێکی تر:کچی من بونایە دەمکووشتن چۆن دەبێ ئاواسەرم شۆربکەن .هەریەکەو قسەیەکی دەکرد. مامۆستا دەهات ووتارێك بۆخەڵکەکە بدات پێش ئەوەی قسەبکات .هەریك لەلایەك قسەیەکی بەمەلا دەووت.ئەوی دەیگووت هەریەکەمان لەمەلایەك زیاتر دەزانین. ئەوی تر:مەلا جاری واز لەئێمەبێنە بڕۆ منداڵەکانی خۆت نسحەت بکەباسی ئەخلاقیان بۆبکە: تا هەستی بەبێزاریەکی زۆر دەکردوو دەهاتەدەر لەمزگەووت . ڕۆژێك دووانساڵێك دووان هیچ ئامۆژگاریەکانی کاریگەر نەبوون .کچەکان دەیان گووت ئێمە لەسەدەی بیست دەژین ئەوباسانەی تۆ بۆسەردەمە کۆنەکان بوو نەك ئێستا. ڕۆژێك باوکیان بیرێکی بۆهات بەیانیەك زوو سەیری کرد کچەکانی خۆیان ئامادە دەکەن بۆ دەوام بچن هاتنەدەرەوە بۆئەوەی بڕۆن چیان دیت.! باوکیان خۆی ڕووت کردۆتەوە لەلای دەرگا وەستاوە.

گووتیان ئەوەچیە چیدەکەی؟

گووتی دەچم بۆدەرەوە :

چۆن بەم جۆرە دەچیتەدەرەوە ؟

ئەویش ووتی بۆچیەتی  هیچ عەیبم هەیە.

باوکە تۆ رووتی جلکت لەبەردانیە چۆن دەتەوی بچیتە دەرەوە خۆشێت نەبوی.

باوك.ئەی ئێوە هەردەم ئاوا ناچنە دەرەوە مادەم وابی ئێوەش شێتن. من پیاوم هەرچۆن بچمە دەرەوە هەرباشترم لەئێوە من هێشتا مکیاجم نەکردوە پرچم بەرەڵانەکردوە.

دەستیان ڕادەکێشا ئەویش خۆی دەپچراند لەدەستیان بەرمدەن بابڕۆم،

باوکە حیامان مەبە وەرە ژووری جلکەکانت لەبەر بکە.

ئەی بۆ من چەندساڵە حەیام چوە پێتان بەگوێتان نەکردم بۆ ڕێزتان لێنەگرتم هەرچەند هاوارم کرد بەخەیاڵتان دانە هات. من پیاوم خەڵك هەرچی بڵێ لە پیاوەتیم کەم ناکات بەڵام ئێوە لەگوڵ ناسکترن بە قسەوسەیرکردنی  خەڵك دەشکێنەوە کچەکانم لەمن دڵسۆزترتان نیە، حەیاو شەرم وڕیز وگەورەی خۆتان لەدەست مەدەن مرۆڤ جارێك دەمرێ بەڵام ئەگەرحەیا وشەرمی لەدەست بدات رۆژی سەدجار دەمرێ، من بۆئێوەمە باش بزانن.

زۆرپەشیمان بونەوە دەستی باوکیان ماچ کردوو. داوای لێبوردنیان کرد دانیان نابەهەڵەکانیان . (تۆبەیان کرد خودا لێان خۆشبێت . لەئێمەش



﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٢٥﴾ صدق الله العظيم {شورى}

**واتـا {هـەر(خـوا)خـۆی پەشـیمانی و(تۆبـە)ی بەنـدەكانی وەرگرێـت، هـەروەها چاوپۆشییی دەكات لەهەڵە وگوناهەكانیان، وەبەو كارو كردەوانەش كە ئەنجامی دەدەن دەزانێت وبەئاگایە}ت،ئا**



# بابەتی سێیەم
# نەخۆشی و کەم دەرامەتی
## (المرض وعُسرالحال)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسْتَعِينُواْ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ

(١٥٣) صدق الله العظيم ﴿ البقرة ﴾

واتا {ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە کۆمەك وتوێشوو وەرگرن، لەئارام گرتن ونوێژ کردن، وەدڵنیابن کە خوا یارو یاوەری خۆڕاگرو ئارامگرانە} ت.ئا، عبدللەی کوڕی عمر لەپێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە .پێغەمبەر درودی خودای لەسەربێ دەفەرموێ(هەرکاتێك خواویستی سزای هۆزیك ونەتەوەیەك بدات سزاکەی تووشی کەسەچاکەکانیش دەبێت کەلەنێوان ئەوان دەژین.پاشان هەریەکەیان لەسەرکاروو کردەوەی خۆیان زیندوو دەکرێنەوە)

نەبوونی وکەم دەرامەتی هیچ کات نەبۆتە شەرم و خۆبەکم زانین.

..... ئەگەر خودای گەورە ماڵیدا بەیەکێك وە نەیدا بەیەکێکی تر مانای وانیە دەوڵەمەندەکەی خۆش دەوێت بۆیە ماڵی پێداوە.یان ئەوەی ماڵی نەداوەتی خۆشی ناوێت. خودا ئادەمیزادی تاقیدەکاتەوە،بەردەوام کەس فەقیرنابێت، زۆرجاریش ماڵ وسامان بەردەوام نابێت بۆهەتا هەتایە. هەروەك تەمەنی ئادەمیزاد. ئەگەر ماڵەکەی بەجێیێ نەهێشت گومانمان لەوەنیە کەمرۆڤەکە خۆی بەجێیێ دەهێڵێت.

تاقیکردنەوەیەکی تری خودای گەورە نەخۆشیە؟!هەردەم ساغ وسەلامەت نابین چۆن بەخۆشیەکان دڵخۆش دەبین بەناخۆشیەکان و نەخۆشیەکان دەبی هەروابین بەلأم شتێکی سەیر هەیە لەناو میللەتی ئێمە ئەگەر یەکێك نەخۆشی رووی تێبکات یان زەرەرێك بکات یان موصیبەتێکی بەسەردابێت لەنەهامەتەکانی ژیان دەڵێن تۆڵەی ئێمەی لێ بویەوە(باشە ئێمەی بێدەسەلأت چین وەچیمان کردوە بۆپەروەردگارمان تا بەویستی ئێمە تۆڵە لەناحەزمان بکاتەوە)لەسورتی:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا ۗ وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلْءَاخِرَةِ نُؤْتِهِۦ مِنْهَا ۚ وَسَنَجْزِى ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ صدق الله العظيم ﴿ال عمران﴾

واتا {هیچ کەسێك نامرێت مەگەر لەسەر ویستی خوا نەبێ،لەکات و وەختی دیاری کراودا(ئەمەش هاندەرێکە بۆئیماندار کەلە مەرگ نەترسێت)جا ئەوەی پاداشتی دنیای دەوێت پێی دەبەخشین،ئەوەش پاداشتی قیامەتی دەوێت هەر پێی دەبەخشین، (بێگومان) پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە(بەجوانترین شێوە)}ت.ئا،

شتێکی گرنگی تریش هەیە ئەونەخۆشیانەی توشی ئادەمیزاد دێت هەرچەند گەورەبێت و چارەسەری نەبێت مانای وانیە کەئەم ئینسانە لەخراپی خۆی توشی بووە، یان ئەو کارە ناخۆشەی بۆی رویدا لەبەر گوناهەکانی بووە (پەروەردگار زۆرکات خۆشەویستی بەسەر دەکاتەوە. نەوەك هەندێك لەنەزانان دەڵێن تۆڵەی لێدەکاتەوە)رێزم هەیە بۆماموستا ئاینیەکان بەلأم،رەخنەیەکم هەیە لەهەندێکیان!. رۆژێکیان(استغفرالله. قورئانیان خستبوە حاویەی زبڵەوە)

مامۆستایەك دوعای لەوانەدەكرد كەئەم كارەیان كردوە.دەیگووت خودایە توشی نەهامەتی وسیل وسەرەتان وسەدان بەلآیان بكەی.بەگوێرەی قسەی ئەم مامۆستایە ئەوانەی كەواخودا توشی ئەم جۆرە نەخۆشیانەی كردوون كاری ناشایستەیان ئەنجام داوە؟! هەموو كەس باش نیە، هەموو خەڵكیش خراپ نیە بەلآم بۆئێمە نەهاتووە ئەو حوكمە بدەین كە كێ باشە كێ خراپە چوونكە ئەوەی ئێمە دەیبینین زاهیرە تەنها دەرەوەیە بەلآم خودا شاراوەكەی دەبینی .
ئەوەی باوەڕی تەواو وپتەوی بەخودا هەبێت دەشزانی كە نەژیان ونەمردن ونەساغی ونەخۆشی وەنە رزق وڕۆژی وەنە هات ونەهات بەدەست كەس نیە غەیری ئەونەبێ. (صدق ربی انه علی كل شئ قدیر)



# پیاوە باشەکە

منـدالْ بـووم تەمـەنم(١٠) سـالأن بـوو لەیـەکیْ لەگەڕەکـەکانی شـاری هـەولێر دادەنیشتین هاوڕیەکم هەبوو هاوسیْ وهاووتەمەن وهـاوپۆلم بوو.یـاری کردن و خوێندنمان هەردەم لەگەڵ یەکتربوو.

هەرچەند مندالْ بووم بەلأم ئەو خێزانە زۆرسـەرنجیان راکێشابووم ! دایکی ئـەو هاوڕیـەم تووشـی شـەلەلی هـاتبوو بـەردەوام لەسـەر جێگاکـەی ڕاکـشابوو نەیـدەتوانی هـیچ جولەیـەك بکـات. ڕۆژێکیـان لەهاوڕێەکـەم پرسـی کـیْ کـاری مالـەوەتان بۆدەکـات؟ گـووتی بـاوکم هـەموو کارێـك دەکـات چەشـتمان بۆلێدەنیْ،مالْ پاکدەکاتەوە،سەرمان دەشوات،جلمان دەشوات،

گـووتم ئـەی کـاری دەرەوە ناکـات ئێـوە پارەتـان هەیـە بۆسـەرفکردن ودەرمـان وچارەسـەری دایکـت؟ گـووتی بـاوکم بـەیانیان زوو هەڵدەسـتی خواردنمـان بۆئامـادە دەکـات وخـواردنیش بـەدایکم دەدات ئـەوکات دەچـێت بۆسـەرکارەکەی،باوکم وەسـتای دیـوارە . کەلەسـەرکارەکەی دەگەڕێتـەوە کارەکـانی مـالْ دەکـات . بـاوکم بێـزار نـابی لەگـەلْ ئەوهـەموو ئەرکـەی لەسەرشـانیەتی کەبـەردەوام دوبـارە دەبنـەوە ڕۆژانـە، مـن زۆرم خۆشـدەوێت چونکە زۆردڵێکـی گـەورەی هەیە خزمـەتی دایکـم ومـن وهـەردوو خوشـکەکەم دەکات بیْ ماندوو بوون .

مـن دڵـم بۆیـان دەسـوتا زۆریـش سەرسـام ببـوم بـە دڵگـەورەی ئـەو باوکـە کەنمونەیان کەمە بەڵکوو هەرنیە لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆمان(ئێوەش وا نازانن)؟

ئێمـە ماڵمـان گواسـتەوە چـوین بۆشـوێنێکی تـر. دوای ١٥ سـالْ ئەوهاوڕێیـەم بینیـەوە لەئاهـەنگی بووکگواسـتنەوە یـەکتریمان ناسـیەوە دوای سـلاو وچـاك وچـۆنی گـووتم : بـۆم باسـکە ئێـوە چـیتان لێهـات ؟باوکـت و دایکـت چـیان بەسەرهات ؟

گـووتی بـاوکم بـەوجۆرە ئاگـاداری ئێمـەو دایکـم بـوو٨سـاڵی تـەواو ڕۆژێـك هاوڕێیـەکی بـاوکم هـات گـوتی بۆخێزانەکـەت نابەیتـە بەغـدا دەڵـێن دکتۆریـك لـەخارج هاتۆتـەوە زۆرباشـە بۆئـەو جـۆرە نەخۆشـیانە بـاوکم گـووتی ئـەوە پارەیەکی زۆری دەوێت خۆشت دەزانی من هیچم نیە؟!

دوای چەند ڕۆژێك هاوڕێکەی باوکم هاتەوە پارەی هێنـابوو گووتی لـەلای خـزم وناسـیاروجیران وهـاوڕێ باسـی تـۆم کـرد هەریـەك بـەگوێرەی تاقـەتی خـۆی یارمەتی دایت .خۆت ئامادەبکە بەزووترین کات بڕۆ .

بـاوکم دایکمـی بـرد بـۆ لای دکتۆرەکـە . ئـەویش بـەباوکمی گوتبـوو بـۆزووتر چـارەتان نـەکردوە تـەنها پێویـستی بەنەشـتەرگەریەك هەیـە لەپـشتی نەخۆشـیەکەی لەقاچـەکانی نیـە.، نەشـتەرگەری بۆکراپـاش هەفتەیـەك بـاوکم هێنایـەوە چـەندمانگێك دوای چارەسـەری سروشـتی دایکم چاك بۆوە . گووتم لەخودا بەزیادبی بەڕاستی زۆرخەمم بوو.

گـووتی دوای چـاکبوونەوەی دایکـم بـە٢سـاڵ جمکـی بوودووکـوڕ وەمـن وخوشـکەکانم شـوومان کـرد. ئێـستا براکـانم دەچـن بۆقوتابخانـە زۆر جـوانن لەیەکیش دەچن.

بەڵام ئەوەی بۆتی باس دەکەم سەیرت پێدێت .گووتم چیە بیڵێ ؟ گووتی ئێستا ٣ساڵە بـاوکم جەڵتـە لیداوە لـەناو جێگـا کـەوتوە دایکـم خزمـەتی دەکـات خـودا مرۆڤەکان تاقی دەکاتەوە هەریەك بەجۆرێك .

گـــووتم بەڕاســـتی ژیـــان ســـەیرە ســـەردەرناکەین لـــە حیکمەتـــەکان وبەسەرکردنەوەکانی خودای گەورە.

# پێشمەرگەی دێرین

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ صدق الله العظیم ﴿البقرة﴾

واتا: {ئەوانەی کەتوشی بەڵاوناخۆشیەك دەبن دەڵێن: ئێمەهی خوای وهەرچی هەمانە بەخششی خوایە،وەسەرئەنجام هەربۆلای ئەوزاتە دەگەڕینەوە،،ئائەوانە ڕەحمەت ومیهرەبانی پەروەردگاریان شایستەیانە،وەئەوانە ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتە بەر}ت،ئاسان.

هەرلەبەرئەوەی بێ دایك وباوك بوو لەتەمەنی ١٨ساڵی کەناوی بانگ کرا بۆ(عەسکەری)نەچوو پەیوەندی کرد بەڕیزی پێشمەرگە لەتەمەنی٢٦ساڵی خێزانی پیکهێنا لەساڵ١٩٧٤گەڕایەوە بۆشارەکەی لەگەڵ خێزانەکەی لەخانوەکی بەکرێ دانیشت . سێ منداڵی بوو بەڵام ویستی ئادەمیزاد وکاری خودا لەیەك دوورە . دوانی مرد تەنها کچێکی بۆمایەوە

دوای چەند ساڵێك پارچە زەویەکی کڕی کردی بەخانوو.

لەڕاپەرینەکە یەکەم کەس بوو دەستی کردە چەك و ڕاپەڕی وەك شێر و هاواری دەکرد ئەوڕۆژەیە کەوا هەولمان بۆی دەدا سەربەرزی کورد.سەرکەوتنی کوردستان بەڵام ئاواتەکانی وخۆشیەکانی هەمووی بوون بەخەون کاتێك کەبۆی دەرکەوت پێشمەرگەی دێرین تەنها ناویکەوبەس. ئەوەی کاریگەرە لەم سەردەمە تۆخەڵك بناسی تۆکیی'!نەك تۆچیتکردوە بۆخاکەکەت بۆگەلەکەت .

دوای ساڵیك لەڕاپەڕین خانوەکەی فرۆشت لەبەر نەبونی ڕویکردە مجەمەعێك

بۆژیان تەنها ژیان دوور لەچاو لەدەست بوونی کەس سپی کاری دەکرد. جار جار سەردانی دەزگاکانی پێشمەرگەی دەکرد بەڵکو کارێکی بۆئەنجام بدەن. زەویك یا خانویەك یا موچەیەکی باش.بەلاّم هەوڵەکانی هیچ فایدەی نەبوو لەساڵی ٢٠٠٥ڕۆژێك لەنەخۆشیەکی کتوپڕی چاوێکی لەدەست دا ئەوکات توانای کارکردنی نەما(پێشمەرگەی دێرین)دوکانێکی بچووکی دانا چونکە موچەکەی (٩٠)هەزاری تەبع بوو(دەکاتەشەش سەد دینار) نەیدەزانی بەچی بدات وەچۆنی سەرف بکات بۆئەوەی خۆی وژنەکەی بژیینی لەوکاتە کە هەردووکیان نەخۆش بوون خێزانەکەی گورچیلەیەکی لەدەستدابوو گورچیلەکەی تریشی تەواونەبوو کەهەردووکیان زۆرپێویستیان بەدکتۆرو عیلاج هەبوو کەدەبوایە بەم تەمەنە ئیسراحەت بکات ڕاکە ڕاکەی نانی ڕۆژێ بەڕۆژێی بوو.

بەلاّم بەم هەموو ئازاروو ناخۆشیە هەردەم شوکربوو .ساڵانە چەند خەتمی قورئانی دەکرد زۆر ڕوو لەخودا بوو .کچە تاقانەکەی هەر لەتەمەنی شەش ساڵی فێری نوێژوو خوداپەرستی وقورئان خوێندن کردبوو . بەلاّم ئەوەی ڕویدا بەم دوایە چاوەڕوان نەکراوبوو کاتێك زیاتر نەخۆش کەوت چەند جارێك لەنەخۆشخانە داخیلدەکرا . چونکە سامانی نەبوو دەسەلاّتدار نەبوو مسئول نەبوو هیچ دکتۆرێك چاودێریەکی باشی بۆنەکرد عیلاجی تەواوی بۆدەستنیشان نەکرد. تاوای لێهات کەوت تاقەتی ئەوەشی نەما بەیانیان دوای نوێژبچێت مەنجەڵی نۆك ولۆبیاکە ببات لەدوکانە بچوکەکەی کە گرتبووی بەکریێ بیفرۆشی. چەندڕۆژێك لەنەخۆشخانەبوو چەند ڕۆژێکیش لە ماڵێ. ڕۆژێك چووم بۆسەردانی دیم لەبەرخۆی قسەی دەکرد پاش سەلام ووتم : دیاربوو لەبەر خۆت قسەت دەکرد ئەویش هەناسەیەکی هەڵێنا ووتی الحمدلله على كل حال ئەوە پارچە هۆندراوەیەك بوو دەمخوێندەوە ؟ منیش زۆرم لێکرد کەبۆمی بخوێنێتەوە .ووتی.

## دەردی نەبوونی

ئـــــای فــــــەقیر بـــــۆ وا خــــــوین تــــــاڵی
دایـــــم بـــــێ خـــــزم وبـــــێ مـــــام وخــــاڵی
مـــــــردن باشـــــــترە لـــــــەم ژینـــــــە تاڵـــــــە
گـــــەر نــــــەتبێ پـــــارە پێـــــت نــــاڵێن خاڵـــــە
چـــــیبکەم لـــــەداخی چـــــەرخی سەرســـــوڕما
زۆرپیـــــاوی نامـــــەرد دەوڵەمەنـــــد دەکـــــا
نـــــەبونیم لای خـــــوا شـــــەرمەزارم دەکـــــا
توشـــــی ناهومێـــــدی وڕێگـــــای خـــــوارم دەکـــــا
کەنیمـــــە پـــــارە نـــــاتوانم بـــــدەم زکـــــات
بـــــێ مـــــاڵی لـــــەخێرو چـــــاکە بێبەشـــــم دەکـــــات
ســـــەربەماڵێ دۆســـــت ودوژمـــــنم دەکـــــات
لـــــەلای نـــــەزانان خـــــوێن تـــــاڵم دەکـــــات

ئەم چەند دێرە زۆر کاریان تیکردم. ڕاستە زۆرجار ماڵی دونیا خەڵك شەرمەزار دەکات.گلەی دڵی خۆی دەردەکرد بە الحمدللە کەتەواوی دەکرد بە اناللە واناالیە لراجعون.

ڕۆژێـــك برازاکـــانی بردیـــان بـــۆلای دکتـــۆرێکی (خـــصوصی)چـــەند تاقیگەوپـشکنینیان بۆکردوهێنایانـەوە بۆمـاڵ گوتیـان بـەیانی فەحـصەکان دەردەچێت.

بۆ ڕۆژی دوای برازاکانی هاتنەوە و بەخێزانەکەی وکچەکەیان گووت مامـان توشی نەخۆشیەکی ترسناك وکوشندەبووە دکتۆر گووتی نەشتەریەکی گەورەی پێویـستە نـسبەی دەرچوونیـشی لەسـەدا سـیە وەئـەوپارەی پێویـستە بۆنەشـتەرگەریەکە ٤یـان٥ملیۆنـە. ئـاخ ئەگـەر مـردن ئاسـان بوایـە ئەگـەر ڕوح

لەجێگایەکی قایم نەدەبوو هەرئەودەم هەردوکیان دەمردن لەبەرخەمی پارەکە نەبووبەڵکو بۆئەو پیاوە بەسۆزە بۆئەو باوکە غەریبە بووئازاری دڵی خۆیان .
خۆزگە دەمتوانی باسی گفتووگۆیەکەیان بەتەواوی بکەم تاکوئێوەش دەتانزانی چۆن بووهەموو باسەکە خۆزگە!
کچەکە لەگەڵ دایکی ڕازی نەبوون بەنەشتەرگەری گووتیان ئەگەر دەرنەچێ خەمان زیاتر دەبێت لەکاتێك دکتۆر گووتی سەرکەوتنی مسۆگەرنیە،بۆی هەیە لەژێر بەنج بەهۆش خۆی نەیەتەوە چونکە نەخۆشیەکەی زۆر درەنگ دۆزراوەتەوە جەستەی زۆربێتاقەت کردوە.ئەوانیش گووتیان ئێمەبەدەستی خۆمان بەرەو مردنی نابەین بەڵکو دەرمان وعیلاج وەربگری باشبێت یان ئەوەندەی ماوە لەژیان چەند ڕۆژێك بێ یان چەند مانگێك لەلامان بمێنێتەوە (هەرکەسێك بیناسیبا دەیگووت سەدعەیف بۆئەم پیاوە ئەونەخۆشیەی لەکێوە بۆهات لەژیانی خۆی پێی لە مێروستانێك نەناوە کەسێکی پاك وقورئان خوێن)بەلاّم هەروەك گوتمان خودا خۆشەویستی خۆی بەسەر دەکاتەوە.
لەسەرەتابۆعیلاج کەپارەکەی کردی تەنها(٣٠٠,٠٠٠)سێ سەدهەزاری تەبع. خزمەنزیکەکانی (بێشەیان)بۆئەم برە پارەیەکرد.هەریەکەوهەندێك بەجارێك نەوەستان کردیان بەدوو کوشتنی ئەم دووئافرەتە لێقەوماوە، لەدڵی خۆیان گوتیان ئەگەربۆتەنها ئەوبرە پارەیە وایارمەتی بدەن ئەی ئەگەربۆنەشتەرگەریەکە ڕازی بوینایە چیاندەکرد چ هەڵوێستێکیان دەبوو ! خزم ودۆست وناسیار!
خەڵکانێك گووتیان ئەوپیاوە پێشمەرگەی دێرینە ئەگەر بچن داوابکەن لەئەوانەی دەسەلاّتیان هەیە بۆعیلاج وچارەسەری بەڵکو بێن دەستی یارمەتی بۆدرێژبکەن یان ڕەوانی دەرەوەی وولاّتی بکەن.!زۆرهەوڵیاندا زۆرجێگایان کرد کیتابیان بۆکرد ئەمەپێشمەرگەی ئێوەبوە چارەسەری دەوێ پێویستی بەداوودەرمانە پێویستی بەزۆر شتە .دوای سەردانیان بۆلای وچاوپێکەوتنیان

بۆیان روونبۆوەکەوا حالەتی باش نیە لەناو جێگا کەوتوە زۆربەئازارە . دوای دوو سێ رۆژ خواخێریان بنوسی ویژدانیان قبوڵی نەکرد هەرلەبەر ئەوە (دوو دۆشەگ و دووبەتانی ودووکیلو شەکروو دووکیلونیسك ودووقوتی ئاوی تەماتەیان نارد)یارمەتی بۆپێشمەرگەی دێرین بەڵکو تاماوەیەکی زۆر پیویستی بەهیچیتر نەبێت(بۆئەوکەسەی کەچەندسالی ژیانی تەرخانکرد بۆکوردایەتی وسەربەخۆی کوردوو کوردوستان) بەلاًم .ئاخ!بۆئەوەی کەکردی بۆکوردستان ئاخ!

تادەهات حالی خراپتردەبوو نەخواردنی ما نەهەستان ودانیشتنی بەلاًم بەهەموو جۆرێك هەر رازیبوو بەکاری خودا دوای دوومانگ لەنەخۆشیەکەی رۆژێك لەدکتۆری بیست کەوانەخۆشیەکەی کوشندەیە،چونکە لەماڵ دلیان نەهات بوو پێی بلێن چ نەخۆشیەکی هەیە؟ گووتی خودای گەورە ئەوانەی ئیمانیان جێگیرە ئەگەر توشی نەهامەتیەکیان بکات خۆشی دەوێن وەئەگەر توشی نەخۆشیەکیان بکات چارەسەری نەبی پلەی شەهیدانیان دەداتی ، من رازیم بەهەموو کارێك وبەلاًیەك ونەخۆشیەك کەلەلایەن پەروەردگارم بێت، خودایە شوکرم،

دواین هەناسەی رۆژی هەینی بوو دواین زەردەخەنەی ومال ئاوای کردن لەخێزانەکەی وکچە تاقانەکەی رۆژی هەینی بوو زۆربەغەریبی بەبێ دایك گەورە بوو بەغەریبش بووبەپێشمەرگە بەغریبی ژیا هەر بەغەریبیش کۆچی دوایکرد (هەرکەسێك دەیناسێ وەئەوەی نایناسێ بۆی بخوێنێ فاتیحایەك)ژنەکەی وکچەکەی تەنهامانەوە لەخزمە نزیکەکانی پیاوەکەی هەندێکیان بەچەند مانگێك ئەگەر بێن بۆسەردانیان . هەندیکیشیان دەلێن خالمان نەما یان مامان نەما بچین بۆلای کێ! پرسیارێك دەکەم؟ کە جێگای داخە دەلێم ئەگەر هەژار نەبونایە دەولەمەند بونایە خزم و کەسیان هەروادەبوون یان زوو زوو

سـەردانیان دەکـردن وهـەواڵیان دەپرسـین ! خـودا لـەمردووی هـەموو لایـەك خۆشبێت انشاالله

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ صدق الله العظیم ﴿البقرة﴾

واتا {ئەوکەسانەش کەباوەڕیان هێناوە وکارو کردەوەی چاکە ئەنجام دەدون، ئەوانـە خـاوەن ونیـشتەجیٚ ی بەهەشـتن وتیایـداژیانی هـەتا هـەتایی دەبەنـە سەر(لەهەرچین وتویٚژ وڕەگەزیٚك بن}ت.ئا،



# لەخۆبایی بوون

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾ صدق الله العظيم ﴿ الاسرا ﴾

واتا: {(ئەی ئینسان)لەشتێك مەدویٚ وباسی شتێك مەکە کەزانست وزانیاریت دەربارەی نیە، چونکە دەسگاکانی بیستن وبینین وتێگەیشتن هەرهەموی، بەرپرسیارە لەبەرامبەریەوە}ت،ئا.

لەساڵیٚ ١٩٩٧ڕۆژێك خوشکێکی ئازیز هاتەلام زۆرنائومیدوو خەمبار دیاربوو، پرسیم چیتە بۆ ئاوا دەتبینم هیچ ڕویداوە خوانەخواستە شتێك بووە ؟گوتی هەست بەدڵتەنگی دەکەم وادەزانم خەمی دونیا هەمووی بەمن دراوە.منیش گووتم کارەکەپێدەچێت گەورەبێت بۆمنی باسکە ئەگەر حەزدەکەی بەڵکوو بتوانم یارمەتیت بدەم ؟ دەستی کردبەگریان وگووتی فەقیرو دەستکورت وهەژاری وەك ئێمە بەهەڵە هاتونەتە دونیا . دوێنی لەگەڵ پیاوەکەم ومنداڵەکان چوین بۆماڵی شوبراکەم خۆشت دەزانی ئەوان هەندێك هەبونن وەباشیش دەزانی من هیچ کات ماڵ وسامان وهەبونی ونەبونی کاری لێنەکردووم من هەرگووتومە چۆن دڵم بەند دەکەم بەدونیا کەکاتیە ومردنی لەدوایە نەوەك ئەوەی لەدونیایە .کەچوین بۆئەوی هەرسەلاممان کرد ودانیشتین ژنی شوبراکەم گووتی بەختتان نیە ئەگەرنا دوێنی دەهاتن جەرگ وناوو برنج وشلەم لێنابوو.گووتمان عافیەتتان بێت ئێمەبۆخۆشیەکی ئێوەسەردانتان دەکەین نەوەك بۆخواردن .دوای دەستی هەڵکردوو گووتی ئەوبازنانەم تازە کڕیوە جوانن؟ گووتمان پیرۆزە .

منیش لەو خوشکەم پرسی چیە هەرلەبەر ئەوە دڵتەنگ بووی؟ گووتی نەخێر من هەردەم بەختەوەرم کەچواردەورم ببینم بەشادی وخۆشی .گووتم ئەی چی وایلێکردی ئەم قسانەبکەی کەپێش کەمێك کردت؟

گووتی.پیاوەکەم پرسی لەبراکەی لەکوێیە؟ ئەویش گووتی چوە بۆبازار هەندی وردە وپێداویستی ماڵ بکرێت هەرهەزار دیناریشی بردوە لەگەڵ خۆی دەترسم هیچی پێنەیەت ! باوکی منداڵەکانم گووتی بۆهەزار دینار دەبات بۆبازار خەڵکی خراپ زۆربوە گیرفان برین پەیدابووە باش نیە بۆدەرەوە ئەم هەموو پارەیەت لابێت.

ژنی شوبرایەکەم بێ هیچ ڕێزیك وپێداچونەوەیەك :گووتی توخدا هەزاردینار پارەیە لەم زەمانە ئەگەر پیاوێك پیاوبێت هەردەم دەبی هەزار دیناری لەگیرفان دابێت ئەوخواردنەی بۆ ئێوەی لێدەنێم پێنج سەد دیناریم لێ سەرفکردوە .

ئەگەر بروام پێدەکەی تەپسی لێنابوو . دیارە ئەوەی نەبوون بێت پیاونیە ئەوەی کەم دەرامەتبی ناوی لەقاموسی پیاوەتی ڕەش دەبێتەوە. پیاوەکەم زۆر بەسەرخۆیدا شکاوە گووتی منداڵەکان ئامادەکە بابڕۆین .ئەوکات زانی پیاوەکەم توڕە بوو بەقسەکانی هەستاو چوە دەرەوە بەبێ ئەوەی داوای لێبوردن بکات لەوقسە ناشایستانەی کەکردی،منیش گووتم دڵتەنگ مەبەگوێ مەدەقسەکانی .پیاوەکەم گووتی ئەو ڕاست دەکات هەربراکەم پیاوە من هیچ نیم چونکە هەزاردینارم لەگیرفان دانیە زوکەن بابڕۆین .

بەڕاستی لەوکاتەوە دڵتەنگم وخەم دەخۆم دیارە ئەوەی پارەی نەبێ مرۆۆ نیە هەست وخواستی نییە چۆن دەبێ وابێ.

زۆردڵ نەوای ئەم دەستە خوشکەم دایەوەکەزۆرشت هەیەهەرچەندە هەوڵی بۆبدەین بەپارەش ناکرێت ئەویش میهرەبانی ودڵ گەورەی ودەروون پاکیە.گووتم دڵتەنگ مەبەخودای گەورەبەخۆی دەزانێ چۆن وەچی باشە وەك دەفەرموی{بسم اللهالرحمن الرحیم } وعسی ان تکرهوا شیئ وهو خیرلکمّ)

لـەزۆركاتان ئـەوەی بەباشـی دەزانـی خراپـە ئەوەیـشی كەبـەخراپی دەزانـی زۆربـاش دەبێـت مـاڵی دوونیـا هـەردەم مایـەی خۆشـی نیـە، منـیش لـە لایـەن خۆمەوە بەم دەستە خوشكەم وئەوانەی وەك ئـەون دەڵێم دڵ خۆشبوون بـەماڵی دونیا تەنها نەزانیە وەنەبونی هیچ كات نابێتـە مایـەی شـەرمەزاری و نائومێدی هەروەك پێشینان گوتویانە(ماڵی دونیاچركی دەستە كزوودەڕوات) ئەوشتانەی توشـی موسـوڵمان دیـت لـەئازاروو خـەم هـەموو دەبـن بەمایـەی سـڕینەوەی گوناهەكان ئەبوهوڕیرە ڕەزای خودای لەسەر دەڵێ كاتێك ئەم ئایەتە دابەزی(من یعمل سوءًا یُعجزُبه)واتـا (هەركـەس خراپەیـەك بكـات سـزای دەدرێـت)زۆركـاری كردەسەرموسـوڵمانان وترسـان بۆیـە پێغەمبـەر درودی خـودای لەسـەرفەرمووی (كاردروست بن هەرچی ئەوشتانەی توشـی موسلمان دەبیت كەفارەتـە بۆ هـەر ناخۆشـیەك كەتووشـی دەبێـت یـان دڕكـیش كەبـچی بەگیانیـدا)صـحیح مـسلم ص٨٩٨ ﴾

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَوْ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزْقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٍ مَّا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٧﴾ صدق الله العظيـم ﴿ شورى ﴾

واتـا {ئەگـەر خـوا رزق وڕۆزیـی بـەفراوانی ببەخـشێت بەبەنـدەكانی، دەسـتیان دەدایـە تـاوان وگونـاه وسـتەم لەزەویـدا، بەڵام بەحیـسابێكی وردو دیـاریكراو دەیانـداتی، بەڕاسـتی ئەوخوایە زۆر ئاگـا وبینایـە بـە بەنـدەكانی وبـە(كـارو هەڵوێستیان}ت. ئا،

# دونیا دەوران دەورانە

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَإِذْ تَأَذَّنَ رَبُّكُمْ لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ وَلَئِن كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ ﴿٧﴾ صدق اللة العظيم {ابراهيم}

واتا {(لەیادتان بێت)كە: پەروەردگارتان بریاری داوە،ئەگەر سوپاس گوزارو شوكرانە بژێربن(فەرمویەتی: رزق وروزیی ونازو نیعمەتتان) بەسەردا دەرژێنم،بەلآم: ئەگەر ناشوكرو نابەرێزبن، بەراستی ئەوكاتە ئیتر تۆڵەو سزای من زۆر بەئازار دەبێت}ت. ئا،

له١٩٩٤كاك(ف)لەیەكێك لەگەرەكەكانی شاری هەولێر لەخانوێك لەگەرەكی(س) بەكری دادەنیشت لەگەڵ خێزانەكەی كچێك وكورێكی هەبوو. كەم دەرامەت بوون .گوزەرانیان زۆرناخۆش بوو كرینی هەموو شتی بەكیلۆ ونیو كیلۆبوو(ف)كرێكاری دەكرد رۆژێك هەبوو سێ نەبوو چونكە وەك ئێستا نەبوو خانوو زۆر دروست بكرێ ناچار دەبوو ئیشی تر بكات ئەوەی رۆژانە بەدەستی دەكەوت بەشی پێداویستیەكانی نەدەكردن چەندەها رۆژیان بەبرسیەتی دەبردە سەر باوك ودایكە دەیان توانی بەرگەی برسیەتی بگرن بەلآم منداڵەكان كەتەمەنیان ٣ساڵ و٤ساڵ بوو نەیان دەتوانی دەگریان . دووڕۆژ دایكیان نانێكی بۆ هەڵدەگرتن هەرجارەو كەمێكی بۆتەردەكردن یەكی پارچەیەكی پێدەدان تاكو بتوانن بخەون رۆژگارەكان زۆربەسەختی تێدەپەرین كری خانوویان بەحاڵ بۆدەدرا بەلآم هیچ چارەیەكیان نەبوو رەمەزان بوو (ف)زۆری پێ شەرمبوو داوای زكات وسەرفترە بكات لەكەس بۆیە بەخێزانەكەی گووت دەچم بۆماڵی براكەم بزانم یارمەتیم نادات ئەوردەزانێ وەزعم چۆنەو كرێچیم و كاتی زكاتە ئەویش هەبوونە. ژنەكەی گووتی من حەزناكەم بچی بۆلای ئەو

خۆی دەزانـی حاڵـت چـۆنە ئەگـەر بیویـستایە یارمـەتیت بـدات دەیتـوانی بێـت وسـەردانێکت بکـات بـەلأم (ف)گـویَ پێنـەدا ڕۆیـشت . چـوو دوای سلاٌوسـەلام. لەسەر ڕووی خۆی هەڵێنا وگووتی برا گیان زکاتت داوە ئەویش گووتی چاکت کرد هـاتی هێشتا نەمـداوە بەکەس خـەمت نـەبیٌ ئـەو(٣٠)دینـارە بگـرە بۆتـۆم دانـاوە (ف)گـووتی ئەوەنـدە پـارە کەمـە بـرام کیلـۆ شـەکرێکی پـیٌ نایـە بیکـڕم بۆمنداڵەکان؟

ئەویش گووتی بەخوا لـەتۆ فەقیر تـر هەیـە دەبـیٌ بیـدەم بەخـەڵکانی تـریش خـۆ ناتەویٌ هەموو پارەکە لەدەستی تۆبکەم وادەزانی هەر ئەتوو نەبونی (ف)گووتی بەخێر نامدەیتیٌ بەقەرد بم دەییٌ براکەی پێکەنی وگووتی بەقـەرد بـدەمی بەچـی دەیدەیتەوە ها!، زۆربەنائومێدی وخەمباری گەڕایەوە ژنەکەی زۆر دڵنەوای کـرد گووتی من نەمگووت مەچوو بۆلای ئەوتەنها خێر دەکات و زەکات دەدات تـابڵێن هەبوونەودەوڵەمەنـدە. خـەم مـەخۆ خـودا هـیچ کـات ئـادەمیزاد لـەبیر ناکـات (ان اللەمع صابرین)،(ف)چەند ڕۆژێك بـەر لەجـەژن چووبۆ کـار بەوەسـتاکەی گـووت پارەکەم مەدەییٌ تاڕۆژی پێش جەژن بەڵکوو بتوانم هەندیٌ وردەبکڕم بـۆ ماڵـەوە تاهەندێك دڵیان خۆش بکەم . ڕۆژی پێش جەژن کەدەکاتە ڕۆژی حالفە نیوەڕۆ بووگەڕایەوە ماڵ دڵی خۆشبوو منداڵەکانی بـانگ کـرد وەرن ئیـستا دەچـم شـتی خۆشـتان بـۆدەکڕم لـەبازاڕ چـیتان بۆبکڕم؟کـچە بـچکۆلأنەکەی گـووتی جلێکـی جـوان کوڕەکـەی گـووتی مـن حـەزم لەبرنجـە بۆمـان بکـڕە (ف)ڕوی لـەدایکی منداڵەکان کرد گووتی ئەی تۆ حەزدەکەی چیت بۆبکڕم ئەویش گووتی کیلۆیـك شەکرو نیو کیلۆ ڕۆن لەگەڵ دوو سیٌ کیلۆ ئارد .گووتی باشە ئیـستا دەچـم زوو دەگەڕێمـەوە. هەسـتا پێلأوەکـانی کـردە پـای گەیـشتە لای دەرگـا بـەقایم یـەکێك لەدەرگای دا ئەویش کەدەرگای کردەوە سەیری کرد خـاوەن خانوەکەیە گووتی فەرموو چیت دەوێت گووتی هاتووم بـۆکریٌ (ف)گـووتی هێشتا چـوار ڕۆژ مـاوە بۆئـەوەی کرێەکـەت بـدەمی خـۆت دەزانـی بـەیانی جەژنـە پێویـستم بەوپارەیـە

.ساحیب خانوەکە گووتی منیش هەرلەبەر ئەوەهاتوم تادوو ڕۆژی تر نەڵێ لەلام نیە سەرفم کردوە بۆ جەژن

(ف)هەرچەندپارایەوە فایدەی نەبوونەڕۆیشت تاپارەکەی لی وەرگرتت زۆر خەمبار بوو لەجیێگاکەی دانیشت .ژنەکەی گووتی خەم مەخۆ هەستە شەیتان بەنەعلەت کە بڕۆ ئاردەکە بکڕە کەس لەبرسان نەمردوە گویٚ مەدەری ئەویش گووتی منداڵەکانم داوای برنجیان کرد چۆن بۆیان بکڕم کەس بەقەردیش بڕە پارەیەکم ناداتی هەتا برای خۆم کەداوام لیٚ کرد نەیدامی دەترسن کەنەتوانم بیدەمەوە.

بەیانی لەگەڵ دەنگی اللەاکبر ی مزگەوت خەبەریان بۆوە،نوێژیان کرد دایکی منداڵەکان هەندی ئەستوکی گەرمی کرد بانگی منداڵەکانی کرد هەستن نان بخۆین . منداڵەکانییان ماچکرد یەکی دیناریٚکیان پیٚدان زۆردڵخۆش، بوون بەم پارەیە ڕایان کردە دەرەوە بۆیاری بەلاٚم کەمیکی پیٚچوو هاتنەوە گووتیان ئەمڕۆ جەژنە منداڵەکانی کۆلاٚن دەڵین ئەمڕۆ برنج و گۆشتمان هەبوو جلکی جوانیان لەبەرکردبوو ئەی ئیٚمە بۆ وەك ئەوان نین ، دایکیان دەستی کردەملیان زۆر گریا گووتی دوای بۆتان دەکرین (لەبەر ئەوەی نەبون بون کەس نەهاتە ماڵیان بۆ جەژنانە وایان دەزانی فەقیری ئەوان نەخۆشیە نەوەك تووش بیٚن)ڕۆژان دەڕۆیشت ئەوخیٚزانەش بەو جۆرەگوزەرانیان دەکرد،لەبەرنەبونی و مسروف گران (کەبەحاڵ دەیانتوانی دار بۆنان کردن وئارد بکڕن تابیٚ نان نەبن لەگەڵ شەکرو چا)تەنها بۆمانەوە لەژیان . ڕۆژیٚك کچەکەی نەخۆش کەووت هیچ پارەی لەگیرفاندا نەبوو نەیدەزانی چیبکات لەکاتیٚك منداڵە بچووکەکەی هاواری دەکردوو دەستی لەسەر زگی داگرتبوو هەر دەگریا،دەیگووت من نازانم چۆن بیبەم بۆلای دکتۆر لەکاتیٚك تەنها دوودینار لەگیرفانم شك دەبەم، ناچاربوو شتیٚك بکات کەنەیتوانی زیاتر بەرگەی گریانی ئەم منداڵە بەستەزمانەبگریٚ گرتیەباوەشی وبۆلای عیادەیەکی برد کەلەماڵیان زۆر دوورنەبوو

كەوایاریـدەدەری پزیـشكی پـیّ دەڵـێن (سـستەر یـان موزەمیـد.یـا پـرین پـێچ )گـووتی منداڵەكـەم نـازانم چیەتی هـەرهاوار دەكـات وزگـی خـۆی گرتـوە ئەگـەر چارەسەری بكـەیت باشـە ؟ ئـەویش گـووتی لەسـەر تەختەكە داینی (ف)گـووتی دكتـۆر بـەلاّم پـارەم لانیـە عیلاجەكـەی بۆبكـە دوای چـەند ڕۆژێكـی تـر پارەكـەت بۆدەهێنم ! لەوكاتە بەبیّ هیچ بەزەیەك گـووتی تـۆ فلاّن كەسـی باشـە تـۆ پـارەی مـن چـۆن دەدەی تـۆ پـارەت نیـە بۆنـان تـۆ كرێـچی .منداڵەكـەت هـەڵگرە بـچۆوە ماڵەوەهەندیّ چەوری بكەن وگەرم داپیۆشن باش دەبیّ(ف)لـەدڵی خـۆی گـووتی دكتۆر ئەگەر پارەم لابا وات نەدەگووت منداڵەكـەی هـەڵگرت چووبۆلای یـەكێكی تر دەنگی نـەكرد تاچارەسـەری كـرد(دەرزیـەكی لێـدا ودووشـرووبی دایـی)گـووتی پارەكەی دەكاتە(٢٥)دینار (ف):ووتی دكتۆر من هیچ پـارەم لانیـە بـدەمیّ چـەند ڕۆژێكـی تـر بـۆت دەهێـنم دكتۆرەكـە وتـی بمزانیبوایـە ئەوەنـدە عیلاجـەم پـیّ نـەدەدا بـەلاّم پارەكـە تـاخیر مەكـە؟ ئـەویش زۆر ممنـون بـوو سوپاسـی كـرد. تـا دەهات باری ژیان قورستر دەبوو نـەی تـوانی سـیّ مـانگ كـریّ خـانوو بـدات هـەر جـاریّ سـاحیب خـانوو دەهـات هەرایـەكی لەگـەڵ دەكـرد لەبـەر پارەكـەی ڕۆژیّ هـاتوو گـووتی ئەگـەر كرێـت پـیّ نـادریّ چۆلیكە بـۆم خـۆمن خـانووم بـۆ خێـرات نەكرییوە دوو ڕۆژی تر دێمەوە یان پارەكەم بۆدادەنییّ یان بڕۆدەرەوە.

خێزانەكەی گووتی دەچم لەلای خاڵم هەندی پارە دەهێنم،چوو بۆماڵیان گـووتی هـاتووم ئەگـەر (٢٠٠)دینـاریش بێـت تـەنها كـریّ مـانگێكیش بـدەیں هەرباشـە خاڵی هەزار سوێندی خوارد كەنیەتی ئەگـەر لەدەستی دابوایـە پێـدەدا وگـووتی بـەڵێنم بەمنداڵـەكان داوە تەلەفیزیونەكـەیان بۆبگـۆڕم بیكـەم بـەكۆنترۆڵ ئـەویش گرانـە بەنۆهـەزارە(٩٠٠٠)ە هەرئەوەندیـشم لایـە.زۆربـەدڵ شـكاوی گەڕایـەوە بەپیاوەكەی گووت من هەڵەم كرد چووم ئەوان لەئیمە هەژارترن خۆزگەشتیكمان هەبوایە پـارەی كردبا تابمـان فرۆشـتایە بـەلاّم لەسـەرەتاوە كـەوا لـەماڵی باوكـت هاتینەدەر هیچمان نەبوو ئەوانیش هیچیان نەداینی نەبەرماڵیك نەدیناریك .

دووڕۆژی پێ چوو خاوەن خانووهاتەوە گووتی هێشتا چۆلت نەکردوە دیارە پارەت پەیدا کردوە ئەوانیش گووتیان ئەو مانگەش سەبر بگرە لێمان تادەتوانین بۆتی پەیدابکەین. بەبێ بەزەییانە ڕوی کردە ژوورەوە چوو ماڵەکەی وردە وردە فڕێدایە دەرەوەی خانوەکە ، (ف)هەرچەند هاواری کرد بۆ وادەکەی خوا قبوڵی ناکا بۆ وامان لێ دەکەی خێزانەکەی لەگەڵ منداڵەکانی دەگریان لەبەر دەرگا وەستابون تا ساحیب خانوو هەموو ماڵەکەی فڕێدانە دەرەوە و دەرگای قایم کردو ڕۆیشت. (ف) هەندێ لایلۆنی کڕی و لە پارچە زەویەکی چۆل کەپرێکی بە لایلۆن دروست کرد ماڵ و منداڵەکەی لە ژێری دانا ، پاش چەند ڕۆژێك بەیانیەکی زوو یەکێك بانگی کرد کێ لێرە؟کێ لێرە دەژی ؟ (ف)هاتە دەرەوە و گووتی : فەرموو من لێرە دەژیم لەگەڵ خێزانەکەم .پیاوەکە گوتی : من بەڕێوبەری ئەم قوتابخانەیی نزیك ئێرەم چەند ڕۆژێکە تێپەر دەبم ئێوە لێرە دەبینم بەسەرهاتی تۆ چیە بۆ لێرە دەژی؟ ئەویش بەسەر هاتی خۆی بۆ گێرایەوە.

مامۆستایەکە گووتی : بەڕاستی ئەم بەسەر هاتەی تۆ زۆر کاریگەرە . ژورێکی زیادەمان هەیە لە قوتابخانەکە ، وەرن بۆخۆتان تیایدابژین (ف)زۆر سوپاسی کردو گووتی : تۆ بەڕاستی پاوێکی باش وبەڕێزی قەت لەچاکەت دەرناچم ، ماڵەکەی گواستەوە بۆ ئەوێ مامۆستاکە ناوی نوسی بۆ (فەراشی) موچەی بۆدابین کرد .(ف)لەگەڵ کارەکەی کاری تریشی دەکرد لە بازار . دوای ماوەیەك حاڵو گوزەرانیان زۆر گۆڕا هەروەك کوردەواری خۆمان دەڵین (ئەوەی لە خوا خافرە کافرە) دوای چەند ساڵێك (ف) خانووی کری بوون بەخاوەن خانوی خۆیان وە دوای ماوەیەك ئۆتومبێل(سەیارە)شی کڕی وای لێهات پاش چەند ساڵێك پارەی بەقەرز دەدا بەخەڵك . خزم و ناسیاری زۆر ببون وە زوو زوو دەهاتن بۆ سەردانی. وە لەساڵ(٢٠٠٨) خانووەکی کری دای بەکرێ . چەندمانگێك چاوەڕێی کرد کرێ چیەکەی پارەکەی بۆ بێنی بەلام نەی هێنا

ئەویش زۆری پێ شەرم بو بچێتە بەر دەرگای کرێچیەکەی داوای کرێی لێ بکا تابووبە پێنج(٥) مانگ هەر کرێی نەهێنا ئەویش هەستا چو بۆماڵیان لەدەرگەی داو کرێچیەکە دەرگای کردەوە سەلامی کردو زوو ناسیەوە بەلاّم کرێچیەکە ئەوی نەناسیەوە .

گووتی: فەرموو ؟

گووتی: هاتوم بۆ کرێ ! تۆ ٥ مانگە کرێچی منی و هیچ پارەت نەداوە ؟

ئەویش گوتی بەخوا هیچم لەدەست دانیە ئەگەر نا کرێیەکەم بۆ دەهێنای (ف)گووتی تادوو ڕۆژی تر لەسەرت دەوەستم کرێی ئەم پێنج مانگەم بۆ پەیاکە . دوای (هەفتەیەك)سەردانی کردەوەو گوتی ئایا کرێیەکەت بۆ ئامادە کردوم کابرا کەوتە پاڕانەوە بۆم پەیا ناکری بڕوابکە ، من زۆر مەمنونی تۆم تۆ ٥ مانگە لەسەرم وەستاوی بەلاّم نیتم کەسیش پێم نادات بەقەردیش نازانم چیبکەم.

(ف) گووتی : مادەم کرێت پێنادرێ وادەچم دوسێ کەس بانگ دەکەم تا ماڵە کەت فڕێ دەنە دەرەوە چونکە من شەرم دەکەم ماڵەکەت فڕێدەم وەکو ئەوەی تۆ کردت کەسێ مانگ کرێم نەدا ماڵەکەت فڕێ دامە سەر شەقام زگت بە ماڵ و منداڵەکەم نەسوتا بەلاّم من تۆڵەی خۆم ناکەمەوە چونکە خوای گەورە هەر خۆی زانایە،من قەت وەك تۆ دڵ ڕەق نابم

ئێستاش چیدەڵێی!کابرا کەوتە گریان گوتی بەراستی تۆ فڵان کەسی تخوا ئەتۆ(ف) گەردەنم ئازاکە ئەوە تۆڵەی تۆیە خوا لەمنی سەندەوە ئیستاش حەقی خۆتە(ف)گوتی: من ئەو کەسەنیم کە بە خەیاڵیش بیری لێ بکەمەوە بڵێم تۆڵەی منە خوا لەتۆی کردەوە وە تۆش ناتوانی وابڵێیت ئێستاش من لە کرێی ئەم پێنج مانگەت خۆش بوم ئێستاش لە خانوەکە دابنیشە ئەگەر کرێکەت پێدرا بیدە ئەگەر پێشت نەدرا گەردەنت ئازابێ کە هاتەوە ماڵ سەیری کرد براکەی لەوێیە هەر ئەوبرایەی داوای قەردی لێکردو پێی نەدا هاتووە داوای قەردی

لێدەکا گووتی : براکەم ئەوکات کرێ خانووم پێنەدەدرا هاتم بۆ بڕێك پارە گوتت نیمە کە تەنها دەعوەتێکت بۆ هاورێیەکانت دەکرد پارەی چوار کرێ خانووی منی پێدەدرا ئێستاش من پارەت نادەمێ بەقەرز،! ئەویش گوتی حەقی خۆتە ،؟ (ف)گووتی بەهەڵە لێم تێمەگە ئێمە برای یەکین هیچ کات خوێن نابێ بە ئاو هەر چەندێکت دەوێ بەچاوان بە گەردەن ئازایی پێت دەدەم تەنها خوا یارمەتیم بداوبتوانم .

زۆرجار لەگەڵ منداڵەکانی دادەنیشت دەیووت من هەرچەند خودا بمداتێ فەقیرێ وهەژاری خۆم لەبیر ناکەم ئەوکاتانە لەبیر ناکەم کەوا نان ببوو بەحەلوا .

هەژاری و دەوڵەمەندی هیچ کات نابێتە مایەی سەرفرازی و لەخۆبایبون زۆر جارشەرمەزاری وناهومێدیە. تەنها ئەوەی مایەیی خۆشیە نیەت پاکی ودڵ پاکیە وهەست بەیەکتری کردنەلەخۆشی وناخۆشیدا.



## بابەتی چوارەم
# چاووزار ڕاستە یان قەزاو قەدەر وهەجەل؟

(ايهما حق، العين ام القضاء والقدر)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٤﴾ صدق الله العظيم { الاعراف}

واتا{(هەموو نەتەوەیەك تەمەنی سنووردارە) لەکاتی دیاری کراودا کۆتایی بەدەوری دەهێنرێت،هەرکاتێ ڕۆژیان تەواو بوو تاوێك دواناخرێن وتاوێکیش پێش ناکەون} ت.ئا،

خوای گەورە ئادەمیزادی بەبێ سەبەب دروست نەکردوە وەبەبێ سەبەبیش نایگەڕێنێتەوە بۆژێر گۆر. چۆن بۆهاتنە دونیای کاتی دیاری کردوە بۆمردنیشی کاتی دیاری کردوە . ئادەمیزاد زۆرجار بە کتووپڕی ماڵئاوای کردوە لەژیان یان بەڕوداو یان بەنەخۆشی یان خۆیان کوشتوە ..هتد!

ئەبوو هورەیرە ڕزای خوای لەسەر دەڵێ . پێغەمبەر درودی خوای لێبێت دەفەرموێ(بڕواداری بەهێزچاکترە وخۆشەویست ترە لای خودای گەورە لەبڕواداری لاواز. سووربە لەسەرئەوەی کەخودا سوودت پێدەگەیەنێت داوای یارمەتیش تەنها لەئەوبکە دەست پاچە مەبە ئەگەر شتێکت توش هات مەڵێ ئەگەر وام بکردایە وانەدەبوو "وا" کاری شەیتان دەکاتەوە)صحیح مسلم ص٩١٤

لەئاهەنگێکی بووك گواستنەوە دووناسیار یەکتریان بینی دوای ماوەیەکی زۆر کەدووربوون یەکتریان نەبینیبوو یەکێکیان پرسی ؟کوڕەکەت چۆنە لەگەڵ

خوێندن ئەوەی من بیزانم دووایین ساڵیەتی ؟ ئەویش لەوەڵامدا ووتی باشەو باشنیە. دەترسم دەرنەچێ ماندوبونەکەی بەلاش بچێ.

لەڕاستیشدا وانەبوو چونکە کوڕەکە لەخوێندن زۆر زۆرباش بوو بەڵکو باشترین وزیرەکترین خوێندکاربوو لەپۆلەکەی، باوکەکەترسی هەبوو لەوەی توشی چاووزاربێ بۆیە وای گووت،

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٥١﴾ صدق الله العظيم {توبة}

واتا {ئەی پێغەمبەر، تۆش بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆپێش نایەت کە خوا لەچارەی نووسیوین(هەرچیش بۆمان پێش دێت هەر خێرە بۆمان) ئەوزاتە (هەمیشە) یار ویاوەر وپشتیوانمانە، دەبێت ئیمانداران هەر پشت بەخوا ببەستن}ت.ئا،



# ڕوداوی کەژاڵ

کەژاڵ کچێکی ژیروو ڕووخۆش و خەندەئامێزبوو لە کۆلیژی(....)دەیخوێند کچی گەورەی ماڵەوە بوو دووبرا وخوشکێکی هەبوو .! دابوو نەریتی کوردەواری هەندێ جار ناخۆشی ودڵ عادزی پەیدا دەکات چونکە لەساڵی هەشتاکان زۆربەکەمی کچان دەیانتوانی خوێندن تەواوبکەن . جیران وخزم وناسیاوەکان دەیانگووت چۆن کچێکی واگەنج وجوان تەنها هاتوو چۆبکات بۆ خوێندنگا ڕۆژێك نیە دوونیە ئاوا چۆن دەبێ . هەریەك لەلایەك بەجۆرێك باسی لەسەردەکردوو دەدوا .

کەژاڵ باوکی نەمابوو لەکاتێك دایکیان هەم دایك وهەم باوك بوو بۆیان،بەنان کردن بۆخەڵك وجلدوورین منداڵەکانی بەخێودەکرد بەم جۆرە دەژیان بەوحاڵەش وازیان لێنەدەهێنان . دایکی دەیگووت لەوکاتەی باوکیان نەماوە خەمەکان وئەرکەکان هەمووی کەوتۆتە ئەستۆی من تەنها خەون بەوە دەبینم ڕۆژێك کەژاڵ خوێندن تەواوبکات ومنداڵەکانی تریشم لەخەم بچنە دەر ئاخ بۆئەم ڕۆژەکەی دێت دەبێ ببینم بەرلەوەی بمرم،ڕۆژی پێنج شەمە بووکەژاڵ گەڕایەوە بۆماڵ هەڵدەپەڕی لەخۆشیان دەیگووت دایکە ڕۆژی شەمە لەگەڵ هاوڕیان ومامۆستاکان دەڕۆین بۆدەرەوەی شار بۆسەفرەو سەیرانگا ڕۆژێکی خۆشدەبێت وانیە چیم بۆئامادە دەکەی چی لەبەربکەم ؟ دایکی گووتی کەژاڵ گیان تۆنابێ بچیت ! کەژاڵ بۆدایکە بۆ؟ ئەویش ووتی کچەکەم خەڵك چی دەڵێن من ناتوانم ڕێت بدەم گیانەکەم لێم تێبگە. بەڵام دایکە هەرچۆنێك بێت خەڵك هەرقسە دەکات ئەگەر لەماڵی خۆت دەرگا دابخەی لەسەرت هەر باست دەکەن، نازانم چیبڵێم کچەکەم ئەگەر براکەت (ك)لەگەڵخۆت دەبەی تابەتەنها نەبی باشترە، کەژاڵ ڕازی بوو کەبراکەی تەمەن دە ساڵنی لەگەڵ خۆی ببات . دایکی چووبۆ بازاڕ کەرستەی دۆڵمەومیوە وچەرەزاتی بۆکڕی هاتەوە بەکەژاڵی گووت

خۆزگە بمتوانیبا شتی زۆرترت بۆبکرم تا زیاتر دڵت خۆشبکەم بەلاّم هەر ئەوەندە لەتوانامدابوو .

ڕۆژی شەمە بەیانی زوو هەڵسان لەخەو خۆیان ئامادە کرد کەژاڵ جلی کوردی لەبەرکرد لەگەڵ براکەی شتوومەکەکانیان هەڵگرتوو گووتی :کاتژمێر بووبەحەوت تانیوکاتژمێری تر دەبێ لەوێ ئامادەبین خواحافیزیان کردوو دەرگایان بەدوای خۆیان قایم کرد گەیشتنە سەری کۆلاّنەکەی خۆیان هاوسی کەیان گووتی کەژاڵ خێرە بۆکوێ بەم بەیانیە زووە یەکێکی تر گووتی بۆواخۆت ڕازاندۆتەوە دەڵێ دەچیی بۆشایی هەریەك بەجۆریك قسەی پێگووت ؟ کەژاڵ : سەفرەی خوێندنگامان هەیەبراکەشم لەگەڵ خۆمدادەبەم ئێستا ببورن دوادەکەوین دوای دەتانبینمەوە . هەندێك ڕۆیشت لەناکاو جلەکانی لەقاچی ئالاّن زۆربەسەختی کەوتەسەر زەوی هاواریکرد ئای قاچم. براکەی گووتی چیبوو هەڵسەوە. هەرچەند هەوڵیدا هەڵبستێتەوە بەلاّم نەیتوانی بەبراکەی گووت بڕۆ زووبانگی دایکم بکە ناتوانم جولەبکەم قاچم زۆرئازاری هەیە،دایکی زووهات ئەوەچیە بۆ واتلێهات بەهەردووکیان کەژاڵیان بڵند کردوو بەهەرجۆرێك بێت بردیانەوە بۆماڵ بەلاّم وردە وردە ئازاری قاچی زیادی دەکرد . تەکسیەکیان هێنایە بەردەرگاو کەژاڵیان خستە ناوی وبردیان بۆنەحۆشخانەی فریاکەوتن . کەدکتۆر سەیریکرد ووتی ئەوە تۆچۆن کەوتووی قاچی خۆت واشکاندوە دەبێ هەرئێستا لەگەچی بگرین بۆت .

کەژاڵ بەدایکی گووت هەموو ئەو باجی(٠)وباجی(٠) بوون چاویان لێدام هەربۆیە واملێهات . دایکی ووتی قسەی وامەکە کچەکەم تۆ بەخۆت لەخۆشیان ئاگاداری بەردەمت نەبوی بۆیە کەوتی . هەرچۆنێك بێت کەژاڵ نەیتوانی بچێت بۆ سەفرەکە لەگەڵ هاوڕێ یانی لەدڵی خۆی دەیووت دەبێ ئێستا لەکوێ بن چیبکەن ئەگەر وام لێنەهاتبوایە لەگەڵیان بووم هەزار خەیاڵی دەکرد زۆری پێنەچوو لەنەخۆشخانە بوو بەهات وهاوار وڕاکردن ئەویش لەگەڵ دایکی

نەیاندەزانی چیبوە . دوای ماوەیەك دکتۆرێك هاتەلای کەژاڵ گووتی ئیستا چۆنی ئازاری قاچت باشتر بووە .

دایکی کەژاڵ گووتی دکتۆر گیان ئەم هەراو هۆریایە چیبوو کەمێك پێش ئێستا؟

دکتۆرەکە ووتی ڕوداویکی دڵ تەزین بوو چەندەها گەنج مردن بەهۆی ڕوداوی هاتووچۆ هەمووی دەگەڕێتەوە بۆلێخورینی خیرا .

لەناکاو بەڕێوبەری خوێندنگاکە لەوێوە تێپەڕبوو کەژاڵ بانگی کردماموستا گیان تۆچیدەکەی لێرە؟ ئەویش سەیری کەژاڵی کرد گووتی تۆچۆنی باشی ئازیزم لەخوا بەزیادبێ دیارە هەرقاچت شکاوە کەزانیم بەپەلە هاتم ئای خوایە گیان ئەوەچیبوو ڕویدا بۆتان. کەژاڵ ووتی هەرمنم ماموستا دایکم باشە تەنها لەبەر من لێرەیە. ئەویش : کچەکەم تۆچی دەڵی تائێستا دوانزە مردوون دیارە دڵیان نەهاتووە بۆت باس بکەن، کەژاڵ لەرزیکی بەلەشداهات گووتی چی ماموستا باسی چی دەکەی؟ ماموستاکە ووتی ئەی تۆش لەگەڵ ئەوان نەبویت لەڕوداوەکە ئەی تۆلەکوێ بوی؟باشە تۆ چۆن قاچت شکاوە؟من نازانم تۆباسی چیدەکەی یا من باسی چیت بۆدەکەم ؟

دایکی ووتی چ باسە ئیوە بۆلەیەکتری حاڵی نابن ماموستای بەڕێز چیبوە تۆبۆلێرەی من دڵنیام تۆ لەبەرکەژاڵی کچم نەهاتووی چی تۆی هێناوەتە ئێرە پێمان بڵی؟ئەویش :ووتی ئەو کۆستەرەی بۆسەفرە دەرچوو بەیانی تووشی ڕوداوێکی ترسناك بویەوە سەرنشینەکانی کەخوێندکارەکان ودوماموستا بوون تائێستا ماموستایەك ویانزە قوتابی مردوون ئەوانیتریش زۆربەسەختی بریندار بوونە منیش کەزانیم توشی ڕوداوهاتون زوو هاتم کەتۆم بینی وام زانی تۆش لەگەڵ ئەوان بوویت بۆیەهاتمەلات لەهەواڵم پرسی ئەگەر تۆ لەگەڵ ئەوان نەبووی تۆبۆلێرەی بەسەرهاتی تۆچیە چۆن قاچت شکاوە؟

کـەژاڵ کەوتـە گریـان وهـاوارکردن هاوڕیـەکانم مـردوون چـۆن ئـەی خوایـەگیان ئەوەچ روداوێکە ئەگەر من لەگەڵیان ڕۆشتبام بۆی هەبوو منـیش بمردمایە مـن هەجـەلم نـەهاتبوو . زۆرگریا بۆهـاوڕی ومامۆسـتاکانی وبۆحـاڵی خـۆی . بـەڵی کـەژاڵ دڵ تـەنگ بـوو بەروداوەکـەی کەبەسـەری هـات بـەڵام کـەس نـازانی چـی بۆئەوباشـە تـەنهاخودای گـەورە نـەبێ ،لەڕوداوەکـە تـەنها چوار خوێنـدکار ژیـان ئەوانی تر مردن کە ژمارەیان بیست وچوار قوتابی بوو.

## نیەت

برایەکی بەڕێز بۆی گێڕامەوە گووتی: لەسوچێکی کۆڵانەکانی ناوبازاڕ پیاوێکی غـەریب وهـەژاروو پـیری بەساڵاچـوو کەوتـە بەرچـاوم بەپەرۆشـبووم بـزانم بەسەرهاتەکەی چیە کەزۆرجار بەلایەوە ڕەت دەبووم دەمدیت هەردەم هەناسـەی سـاردی هەڵدەکێـشاو دەیگـوت ئـاخ . زۆر پرسـیارم دەکـرد لەوخەڵکانـەی دەوروبەری هەموو هەریەك وڵامیـان دەدایـەوە کـەهیچ نـازانن چونکە ئـەو ڕازی نیە باسـی خـۆی لـەلای کـەس بکـات هەرچـەند داوامـان لیکـردوە ! چـەند ڕۆژیك لەلای دادەنیشتم دەمگووت من بەسەرهاتی تۆ نازانم چیە ئایە ئەوەندە دەهێنی والەخۆت بکەی هەمووکات مـات ومـەلول بیـت وخـەیاڵاتی زۆربکـەیت؟ دەیـووت هەستە لەلام بۆخۆت بڕۆ کـاتی خـۆت بەفیڕۆمـەدە. ڕۆژێك گـووتم مـن حـەزدەکـەم بـەژداری خـەمـەکانت بم تـەنها دڵـت بـۆم بکـەوە بـەڵکو بتـوانم یارمـەتیت بـدەم . ووتـی دیـارە تـۆ وازنـاهێنی .؟گـووتم نـەخێر ئـەمرۆش بـۆم بـاس نەکـەی بـەیانی دێمەوە باشترە بۆم باسکەی. هەرچۆنێك بێت رازیم کرد کەبەسـەرهاتـەکەی بـاس بکات بۆم،

ووتـی: مـن تەمـەنم(٥٢)سـاڵە زۆر بەتـەمن نـیم بـەڵام خـەمی دونیـا وبەسـەرهاتە کتووپڕەکان منییان پیرکرد. خاوەن ماڵ ومنداڵ وماڵاتێکی زۆربووم چوار کوڕو

ودووکچم هەبوو کوڕەکانم گەورەتربوون لەکچەکان . بۆهەرچواریان ژنم هێنابوو هەریەکەیان دووسێ منداڵیان هەبوو.

لەم ساڵانە وەك ئاگاداری باران نەدەباری ووشکاتی وقات وقڕی ڕویتێکردین. لەترسی نەمانی مەڕوماڵاتمان ڕومان کردە دێهاتێك لەناوچەی سەرەوە مانگی نیسان بوو لەدۆڵێك ڕەشماڵمان هەڵدابوو خەریکی ئیش وکاری ڕۆژانەی خۆمان بووین بەیانیان لەگەڵ یەك لەکوڕەکانم دەچوین بەتۆیۆتا بۆ بازاڕ ماست وپەنیرو فرۆ وژاژییمان دەبرد کەدەگەڕاینەوە بەهەمان شێوە پێداویستی خۆمانمان دەکڕی نزیکەی بیست ڕۆژێك وا دەگوزەراین زۆرشاد بەختەوەربوین چونکە لەوەڕەکەی ئەم ناوچەیە زۆر بەپیتوو بەرەکەت بوو.

ڕۆژێك بەرەو ئێوارە مەڕوماڵاتەکەمان هێنایەوە منیش وردە وردە بەسەر گردێك کەوتم کەنزێك ئەوێ بوو بەرامبەر خاووخێزانەکەم دانیشتم دوور بەدووری سەیرم دەکردن خێزانەکەم وبووکەکانم وکچەکانم وکوڕەکانم ونەوەم هەموو لەم ناوە خەریکن هەریەك بەکاری خۆیەوە. لەوکات نیەتێکی خراپ بەدڵم داهات شەیتانی پیس غەڵ غەڵەی بەدڵم کرد بێ ئەوەی بڵێم(الحمدلله)یان (ماشاالله)ووتم سەیرکە ئەم دۆڵە هەمووی پڕەلەماڵاتم پێنج سەد سەر حەیوانم هەیە،کوڕوکچ ونەوەم هەیە قەت بڕواناکەم من بێ کەسبم یان هەژاربم ؟ کەم ناکات بەڵکوو هەر زیادیش دەکات. خۆئەگەر کچێکم بمری یەکم بۆدەمینێ وەئەگەر دووکوڕم بمری دووم بۆدەمێنێ وەئەگەر دووسەد سەرمەڕم نەمێنێ سێ سەدم بۆ دەمێنێ.هەرلەسەر گردەکە تۆزێك ڕاکشام ماوەیەکی کەمی پێچوو هەوور بەری ئاسمانی گرت .گووتم بارانی بەهارە دەباببارێ . پاش کەمێك نم نم باران دایگرت بەرەبەرە زیادی کرد هەرگووتم ئیستا تەواو دەبێ گەوارەی نیسانە زوو تێدەپەڕێت بەلأم هەر لەزیادبووندابوو تاوەکو بوو بەلافاوجێگاکەی من بەرز بوو بەلأم ئەوجێگایەی خاووخێزانمی لێ بوو دۆڵ بووهەر چەند هاوارم کرد گوویان لەمن نەبوو ئەوانیش هەروایان زانی کەمێك ددباری بۆیە

چوونە ناو ڕەشماڵەكە هەرچەند دەمویست ڕاكەم بۆلایان قاچەكانم هەڵیان نەدەگرتم هەرچەند هەوڵم دا بێ فایدەبوو هەرئەوەندەم دی لافاوەكە ڕویكردە دۆڵەكە هەمووی ڕاپێچ دا منیش هەرسەیر دەكەم ماڵ ومنداڵ وماڵاتم هەموی برد ئەسپەكەم لەشوێنێكی دوور لەوان بەستابویەوە سەیرم كرد گوورگێك بۆلای ڕادەكات بەغار دەیەوێ پەلاماری بدات منیش كلاشینكۆفەكەم لەلابوو یەكسەر نیشانم لی گرتوو كوشتم لەتاو هەمویان منیش رقی خۆم بەم گورگە دەركرد. بۆماوەی نیو كاتژمێر بارانێكی بەخوور هاتەخوار .دوای هەور لەئاسمان نەما منیش هەستام لەشوێنەكەم بزانم قاچم چی بەسەرهاتوە بۆ هەڵم ناگری بەلاَم هیچ عەیبێكیان نەبوو تاتوانام هەبوو ڕامكرد(دەمێك وەستا لەقسەكردن چونكە گریان ڕێی پێنەدەدا هەر فرمێسكەكانی دەسڕی هەناسەی هەڵدەكێشاو بەدەستی لەسینگ وقاچی دەداو دەیگووت ئاخ ئەوە چیبوو نازانم)! چووم بەلاَم چیم بینی خودایە ئەوەی دوژمنیشە نەبینێ ئەوەی لەگەڵ لیتەو ئاو خنكاوە ئەوەیشی دیارنەماوە كە بۆكوێ بردوە ئەم لافاوە ڕامكردە لای ئەسپەكەم بۆئەوەی بچم خەڵك ئاگاداربكەمەوە لەوەی بەسەرمان هات سەیرم كرد كوڕە گەورەكەم لەوێوە كەوتوە ناڵە ناڵیەتی لەباوەشم گرت ئەوەچیە كوڕم چۆنی تۆباشی؟گووتی باوكە تۆ لێت دام تۆم بینی لەسەرگردەكە ویستم بێم بۆلات ئاگادارت كەمەوە وامزانی نازانی .بەلاَم تۆگولەیەكت لێدام وبریندارت كردم.

گریام لەسەری خۆمدا گووتم باوەڕم پێبكە كوڕم وامزانی گوورگی پەلاماری ئەسپەكەم دەدەی بەلاَم زۆری پێنەچوو ئەویش مرد منیش كەئەولەبەر دەستم گیانی دەرچوو كەزانیم بەخۆم كوشتم كەشەیتانی نەعلەتی وای لێكردم لەداخان چەكەكەم كەهێشتا لەدەستم دابوو بەقایم بەزەویم دادا قۆنداغەكەی بەرزبۆوە بەچاوم كەوت چاوی ڕاستەم كوێر بوو وەك دەبینی . مغریب داهات دونیا تاریك بوو هەر ئەوتاریكیە بەردەوام لەژیانم ماوەتەوەو هەر دەمێنیتەوە .

نیــەتێك وغەڵغەڵەیــەکی شــەیتان مــاڵی کــاوڵکردم تــەنها بــەماوەی کــەمتر لەکاتژمێرێك هەموو خۆشیەکانی ژیانم هەمو و شتێك بوو بەخەون بەڵام بەداخم کەخەوون نیە بەڵکوو راستیەکی تاڵە خۆزگە منـیش دەمـردم لەگـەڵ ئـەوان بـەڵام خودای گەورە منی ژیاند تابەچاوەکانی خۆم ببینم لەناوچوونی بنەماڵـەم لەبـەر غروری خۆم .

ئایـە ئـەوەی بەسـەرم هـات چـاو زاری خـۆم بـوو یـان قـەزاو قـەدەر بـوو یـان. یان....هتد!

منیش دەڵێم (ئەم ڕوداوە بەسەرهاتی پێغەمبەر ئەیوبم بەبیر دەهێنێتـەوە) علیـە سلام.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةً ۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ

(٣٥) صدق الله العظيم ﴿الانبياء﴾

واتا: {هـەموو کەسـێك دەبـێ مـردن بچێژێ و(شـەرابی مـەرگ بنۆشـی)ئێمـە ئێـوە تاقی دەکەینەوە بە شەڕو ناخۆشی وبەڵا، وەبەخێرو خۆشی ودارایی وتوانـایی سەرئەنجام گەڕانەوەتان بۆ لای ئێمەیە}ت،ئا.

(مرۆڤـی بـاوەڕدار تـاقی دەکرێتــەوە ، ئەگـەر بەرگـە بگـرێ ئـەوە لـە قیامـەت پاداشتی زۆر وەردەگرێت)انشاالله،



# هەجەلی چۆن هات؟

لەساڵەکانی (١٩٨٠تا ١٩٩٠)حکومەت بەعس دەستی بەهەڵمەتێك کردبوو کوردەکانی دەگرت بەناوی پێشمەرگە وڕاکردوو لەخدمەی عەسکەری . زۆری کیمیاباران وئەنفال کردکەبەهیچ جۆرێك ئەوەی زەرەیك بەزەیی لەدڵ دابوایە پێ قبوڵ نەدەکرا کەئێستاش لەبیرنەکراوەو لەبیریش ناکری هەرچەند کاتەکان وساڵەکانیش تێپەڕبن چونکە لەناخمان برینێکی قووڵی جێهێشتوە.

زۆرگەنج وئافرەت و پیر بونە قوربانی بەبێ تاوان ، لەدێ یەکانیش کەس پارێزراو نەبوو لەدەستی چەند گەنجێکیان گرت لەگوندی(..)بۆچەند مانگێك بێ سەروو شوێن بوون . کەس وکاریان زۆر بەدوایان داچوون بۆئەوەی تەنهابزانن چیان لێهاتوە ماون یان مردون هەوڵیان دا واصیتەیان کرد پارەی زۆریان ژمارد. تاڕۆژێك هەواڵیان پێگەیش هێشتاماون دیسان بەسەدجۆر پاڕانەوەو پارەدان وتەشەبوز بەکاربەدەستان بەڵکو بتوانن بچن سەردانیان بکەن بیان بینن . دوای ساڵێك خەبەریان بۆهات کەوا ڕێیان پێدراوە سەردانیان بکەن لەبەندینخانەی(..)

ئەوان بەپەرۆش بوون بۆ بینینیان ڕۆژەکە دیاری کرا ئەوەی دەچێت بۆ دیتنی برای ئەوی تر پیاوی ئەوی تر کوڕی هەریەك بەجۆرێك : خەڵکەکە خۆیان ئامادە کردوو کۆستەرێکیان گرت. دایکی کاك(ج)وەك خەڵکی ئاوایی خۆی ئامادە کردوو لەگەڵیان بڕوات بۆدیتنی کوڕە تاقانەکەی کەوا ساڵێکە نەیبینیوە زۆرپەرۆشە بۆی کەلەمنداڵی بەبێ باوك گەورەی کردوە هەم دایك بوە بۆی هەم باوك . زۆرشتی کڕی بوو لەخواردن و جل وبەرگ ،بەناوی خودا بەڕێ کەوتن .کەمێك ڕۆیشتن دایکی (ج)هەرخەریك بوو پشتی خۆی دەخوراند .پاشان پشتی خۆی بەپاڵ پشتی کوشینەکان دادەخشاند، ئەوئافرەتانەی لەگەڵی بوون گووتیان ئەوەچیە بۆ بەم جۆرەپشتت دەخورێنی ووتی واهەست دەکەم مێروستانێك لەپشتمە . پاش کەمێك دیسان دەستی بەجولەجول کرد ئافرەتەکان ووتیان باسەیرێکی پشتت بکەین بزانین چیە ئاوا نارحەتی کردووی لەلای ملیەوە سەیری پشتیان کرد گووتیان هیچ دیار نیە نازانین چی تۆی نارحەت کردووە یەکێکیان کردیە پێکەنین وگووتی لەخۆشی ئەوەی دوای

سالێك کوڕەکەت دەبینی جولەت پێکەوتوە بەتەمای لەخۆشیان بال بگری .زۆری ڕۆیش کەمی ماوە ئێستا دەگەین ئەوەندەپەلە مەکە. بەلام دایکی (ج)هەر دەیگووت من دەزانم شتێك لەناو جلەکانمە بەلام نازانم چیە ئێوەش هەر گاڵتەم پێبکەن .ووتیان دیارە دڕکێك بەجلەکانتەوە نوساوە ئێمەش سەیرمان کرد بەلام هەر نەماندۆزیەوە خۆشت باش دەزانی پیاومان لەگەڵ دایە ناتوانین جوانتر بۆت بگەڕێن. بەهەرجۆرێك بێ ڕیگاکەی بڕی گەیشتنەجێگا ناویان خوێندرایەوە دایکی(ج)کەچاوی بەکوڕەکەی کەوت زۆر بێ تاقەت و ڕەنگ زەرد بوو. کەوتە گریان ولەباوەشی گرت .(ج) دەستی دایکی ماچ کردوو گووتی دایە گیان توخودا والەخۆت مەکە من باشم ئەگەر هیچم لەسەر نەدۆزنەوە هەر بەرم دەدەن باماوەیەکی پێبچی . بەینێك دانیشتن بەیەکەوە بەلام دایکی ناوە ناوە هەر پشتی خۆی دەخوراند.

(ج)ووتی دایکە چیە بۆ ئەوەندە پشتت دەخورێنی خوانەخواستە هیچ بووە ووتی نەخێر کوڕم هیچ نیە بەلام ماوەی ئەو هەموو ڕێگایە مێروستانێك لەناو جلە کانم دەسورێتەوە ناڕحەتی کردووم .

(ج)بێنە باسەیرێکی بکەم بۆت.

ووتی کوڕم لەڕێگا ئەم ئافرەتانە زۆر گەڕان لەناو جلەکانم هیچیان نەدۆزیەوە لێم گەڕی تادەچمەوە ماڵ ئەوکات هەموو جلەکانم دەگۆڕم.

(ج)باسەیری پشتت بکەم من کوری تۆم شەرم مەکە. ئەو ووتی نابێ ئەویش هەر دەبێ سەیری کەم بۆت ئەم سەین و بەینە کاتێکی خایاند .لەناکاو بانگ کرا گووتیان موهاجە تەواو زووکەن .

(ج)دایە گیان نەتهێشت تەماشاکەم بۆت بزانم ئەوە چیە وا ناڕحەتی کردووی تۆ چۆن بەم جۆرە دەگەڕێیەوە لەڕێگا چی دەکەی دڵم هەر لەلات دەبێت . گووتی ڕاست دەکەی کوڕم باشە لەلای پشتی ملم دەستت ڕەوان بکە بەڵکو ئەم مێروستانە بدۆزیتەوە کەئەم ئافرەتانە نەیان دۆزیەوە ئەویش دەستی لەپشتی ملی ڕەوان کرد تابزانێ ئەوە چیە دایکی ئازار دەدات و ناڕحەتی کردوە لەپڕێك (ج)پڕ بەدەنگ هاواری کرد کەهەموو ئەوانەی لەوێن سەیریان کرد .دایکی گووتی ئەوەچی بوو بۆ هاوار دەکەی .دەستی لەپشتی ملی دایکی دەرهێنا چی

ببینن ئەوەی لەماڵ دەرچوون لەگەڵ دایکی دابوو ئەوەی کوڕەکەی بۆی دەرکرد ودۆزیەوە کە ئەوانی تر پێیان نەدۆزرایەوە کەلە دێیەکەی خۆیان بۆی هێنا بەدیاری (دووپشك)بوو . دووپشك لەناو جلەکانی دایکی بوو بە(ج) ی وەدا تاخەڵکەکە خڕبونەوە لەسەری تەنها دەدەقیقەی خایاند گیانی سپارد ومرد.

چووبۆ دیدەنی بەڵام لەخەیاڵی کەس دانەبوو کەوا بەمردووی دەیهێنێتەوە لادیکەیان. تاماوەیەکی دوور ئەم دایکە بەستەزمانە فرمێسکەکانی وشك نەکرد هەردەم دەگریاو دەیگووت خۆزەگە ساڵێکی تریش نەمزانیبوایە لەکێ یە بەس بمابوایە خۆزگە هەر نەچوبومایە لای من لێرە لەگەڵ خۆم بردم تا ئەوی بۆ بەمنی وەنەدا بۆتەنها ئەو. خۆزگەکانی زۆربوون بەڵام خۆزگە هیچ ناگێڕێتەوە .

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ إِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ صدق الله العظيم ﴿يونس﴾

واتا {(پێغەمبەر)پێیان بڵێ،توانای ئەوەم نیە کەزەرەرێك یا قازانجێك بەخۆم بگەیەنم هەتا ویستی خوای لەسەر نەبێ،هەموو قەومێك کاتی دیاریکراوی هەیە بۆ کۆتای هاتنی، هەر کاتی ئەوساتە گەیشتنە تاوێك دوا دەکەون، نەساتێك پێش دەکەون} ت،ئا.



# كامەیان زووتر گەڕایەوە بۆبارەگای خودا

كاك(س)بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە دەڵێ : دایكم (جەڵتە)لێدا زۆربەسەختی نەخۆش بوولە دەست وقاچ كەوت ئێمەهیچ هیوامان نەما كەدایكم چاك بێتەوە، هەموو ڕۆژێك هاتووچۆمان بوو بۆ نەخۆشخانە مانگێك دووان بەڵام هەروەك خۆی بوو زۆر خەمباربووین بۆحاڵی دایكم كە دەماندی زۆر ئازاری دەكێشا هیچیشمان لەدەست نەدەهات بۆی بكەین تەنها پاڕانەوەو دوعاكردن بەڵكو خودای گەورە شفای بدا.

چەند ڕۆژێك مابوو بۆ جەژن لەكۆتای مانگی ڕەمەزان دابوین لەماڵەوە بەگشتی رامان لەسەر ئەوەبوو بۆجەژن بیهێنینەوە ماڵ تادوای جەژن چونكە زۆر هیلاك ببوین لەنەخۆشخانە. ژیان هەربەدەستی خودایە ئێمەش بەهەموو توانامان ئاگاداری دەبین ئەم عیلاجانەی لەنەخۆشخانە وەری دەگرت لەماڵەوە بۆی دابین دەكەین لەبەر ئەو خزموو ناسیاوانەش كەدێن بۆسەردانی دایكم هەرماڵەوە باشترە . بۆبەیانی هێنامانەوە بۆماڵ .

دووڕۆژ مابوو بۆجەژن باوكم ووتی ئەوڕۆ مەجالم هەیە دەچم موچەی خانەنشینەكەم وەردەگرم زۆر ئاگاداری دایكتان بن تادەگەڕێمەوە دەترسم بەیانی بیكەن بەپشوو نەتوانم موچەكەم وەرگرم هەرئەوڕۆ باشترە بەبازار دادیمەوە هەندێك شت دەكڕم ؟

ئێمەش گووتمان بابە گیان خەمت نەبێ ئاگامان لێدەبێ .باوكم خواحافیزی كردوو ڕۆیشت ،كەسەیر دەكات خەڵك زۆر وەستاوە ئەویش بەفەڕاشەكە دەڵێ ماندوو هیلاكم ناتوانم زۆر ڕاوەستم دەچم لەسەر ئەو كورسیە دادەنیشم ئەگەر ناوم بانگ كرا ئاگادارم بكەوە ؟ ئەویش دەڵی خاڵەگیان خەمت نەبێ تۆبڕۆ ئیسراحەتی خۆت وەرگرە ناوت بانگ بكری خەبەرت دەكەمەوە .كەمێكی پێ دەچی فەڕاشەكە دێتەلای بانگی دەكات خاڵە.خاڵە بانگت دەكەن چەندجار دووبارەی دەكاتەوە بەلاّم هیچ وەلاّم ناداتەوە ئەویش دەست لەدەستی دەدات

هەستدەکا زۆرسـاردە بـانگی خەڵکەکـە دەکـات وەرن بـزانن ئـەوپیاوە چـیەتی ؟هەموو خەڵك هاتن سەیری دەکەن مردوو. کاك(س)ووتـی ئێمـە بـیٚ خەبـەربوین لـەم ڕوداوەی بەسـەرباوکم هـات . تەلـەفۆنمان بـۆکرا مـاڵی فـلاٚن کەسـە ئێمەلـە دەزگای (.)بۆموچەی خانەنشینی پەیوەندی دەکـەین باوکتـان هەنـدیٚ نەساغە بیبەنـەوە (س)گـووتی ئێمـە زۆرمـان پـیٚ سـەیربوو بـاوکم باشـبوو نـەیگووت شـوێنێکم ئازاری هەیـە ئەگـەر وابـا یـەکێکمان لەگـەڵی دەچـوین. دەڵـی بەپەلـە چوین چیمان بینی باوکم لەسەر تەختەیەك درێـژ کـراوە گیـانی لەبەردانـەماوە . فەراشـەکێ دەگریـا وبەسـەرهاتەکی دەگێڕایـەوە دیگـووت مـن ئێـستا لـەمردن دەترسم ئەگـەر بۆمنیـان باس بکردبوایـە قـەت بـاوەڕم نـەدەکرد کـە مـردن ئـاوا لەناکاو بیٚ کات وسات دیٚ (اناللە وانااليەلراجعون)بردمانەوەبۆماڵ خوشکەکانم کردیـان بـەهاتوو هـاواروو گریـان جیرانـەکان هـاتن دەیـان ووت خـوا عـافوی بکـا ژنێکـی بـاش بـوو یـەکی دەیگـووت دەتـان زانـی دەمـریٚ بۆیـە هێناتانـەوە بۆمـاڵ ئـەوەی دەیگـووت لەنەخۆشـخانەبوایە باشـتر بـوو بـۆی ئێمـەش هـەردەمانگووت دایکمان نیە باوکمانە مردوە . خەبەریان دەدا بەخزمەکان ئـەوانیش دەیانگووت چەند مانگیکە نەخۆشە ئیسراحەتی کـرد هەردەبوایـە بڵـێن باوکمانـە (س)دەڵـی ئێمەچاوەڕی مردنـی دایکمـان دەکـرد کەچـی باوکمـان بـیٚ ئـەوەی نەخۆشبیٚ بـە کتووپڕیٚ مرد.

بەلاٚم ئەوەی من دەمەویٚ بەئێوەی ڕابگەیەنم کە دایکم تائێستا لەژیان مـاوە هـیچ باشتریش نیە کەئێستا ماوەی چوارساڵە باوکم مردوە .

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٥﴾ صدق الله العظيم ﴿الحجر﴾

واتـا {هـیچ میللـەت وهـیچ گـەلێك پـێش کـاتی دیـاریکراوی لـەناوبردنی خـۆی نەکەوتوە(وەهەرگیز) دواش ناکەوێت} ت،ئا.

# ڕوداوەکەی کاك(خ) چۆن بوو

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ صدق اللة العظيم ﴿ النمل ﴾

واتا: {بەڕاستی پەروەردگاری تۆ خاوەن فەزڵ و بەخشندەییە بەسەر خەڵکیەود،بەلاّم زۆربەیان سوپاسی ناکەن}ت،ئا.

ماڵی (خ)لەهەولێرە بەلاّم کەبوو بەمامۆستا ناوی لەدێی (..)هاتەوە. ماڵ ومنداڵی لەگەڵ خۆیدا برد بۆ ئەویّ .!ئێستا تۆزێك دەگەڕینەوە بەرلەئەوەی ببێت بەمامۆستا ژیانی چۆن بوو؟ کەخوێندنی تەواو کرد زۆری هەوڵدا لەشوێنێك دابمەزریّ فایدەی نەبوو . دەیگووت هیچ شتێك لەگیرثانی بەتاڵ خراپتر وناخۆشتر نیە! ناچار هەموو کارێکی دەکرد هەتا حەماڵیشی دەکرد شەرمی نەدەکرد دەیگووت بەئارەقەی نێوچەوانی خۆم پارە پەیادەکەم (عیزی ودزی) نەبیّ هیچ عەیب نیە. هاوڕیەکی ئازیزی ڕۆژێك هاتە لای گووتی : من ساڵانێکە تۆدەناسم لەتەمەنم دا کەسم نەدی وەك تۆ ڕاست گۆو بەوەفابیّ لەبەر ئەوە پێت خۆشبیّ یان نا من هەر خوشکەکەی خۆمت دەدەمیّ (خ)دەستی بەپێکەنین کرد گووتی دیارە زۆر رقت لەخوشکەکەتە ئەگەر نا چۆن دەیدەی بەمن هەر بەحاڵ بژێوی ژیانم دابین دەکەم ئەگەر باوکم موچەی خانەنشینەکەی نەبوایە ئێمە فەوتابووین. ئەویش گووتی هەر لەبەر ئەوە من خوشکەکەمت دەدەمی چونکە تۆڕاست گۆی هاوڕێیەکی باش وبەوەفایی زانیتت؟ (خ)بەلاّم من هەر هیچم نیە ژنی پیّ بهێنم .دیسان ووتی منیش پیاو دەکڕم خوشکم نافرۆشم من لەبەرئەوەی دەزانم تۆ لەگەڵ ئەو دەگونجی بۆیە هەر دەتدەمیّ. !

ژنی هێنا لەگەڵ دایك و باوك وخوشکو براکانی دەژیان بوون بەخاوەنی کوڕێك وکچێك . ڕۆژێك هاوڕیەکی قوتابخانەی هاتە لای ووتی مزگێنیم بدەی

ناونوسین دەستی پێکردۆتەوە بابەیەکەوە بچین ناومان بنوسین زۆر دڵخۆش بوون چوون ناوی خۆیان تۆمار کرد بەلاّم ناوی (خ)نەگەڕایەوە کەس نازانێت خێر لەچی دایە بەڵکو ماندووبونەکەو حەماڵیەکە باشتر بوایە (الی مكتوب علی جبین لازم تشوف والعین) ئەوەی لەنێوچەوان نوسراوە هەر دەبێ بیبینین. زۆرواسیتەی کرد تاناوی گەڕایەوە بۆمامۆستایی .هەر وەك لەسەرەتا باسمان کرد؟

ئۆتۆمبێلی نەبوو بەلاّم چونکە لەماڵەوە دورنەکەوتبۆوە زۆرخۆی پێ ڕانەدەگیرا زوو زوو دەگەڕایەوە بۆ هەولێر بۆسەردانی خۆشەویستان ونزیکان ،

رۆژێك بەخێزانەکەی گووت چۆنە سەیارەیەك بکڕین ؟ ئەویش ووتی منیش حەز دەکەم بەلاّم بەچی بیکڕین هیچ پارەمان نیە!مامۆستا(خ)ووتی ئێستا موچەم هەیە ئەگەر هەندێ پارە لەخزم و ناسیار وەرگرین بەقەرز هەندێکیشی دەکەین بەسولفە لەبانك .

چووە لای برای خێزانەکەی باسەکەی لەکن کردەوە ئەویش گووتی تۆ بەڕاستی جوێنم پێدەدەی من کەهەم چۆن داوا لەکەس دەکەی بۆ پارە(خ)گووتی منیش هەرلەبەر ئەوە یەکەم کەس لەدەرگای تۆمدا تائێستا داوای دینارێکم بەقەرزیش لەکەس نەکردوە بەلاّم ئێستا جیاوازە وایە؟ لەگەڵی چووسەیارەی کڕی نیوەی پارەکەی بۆدا ئەوەیتریش بوو بەمانگانە .بە(خ)ووت کەی پارەکەی بانکت دایەوەئەوکات وردە وردە پارەکەی من بدەوە خەمی لێ مەخۆ وای دانێ قەرزار نی چونکە منیش کاتی وام بەسەر هاتوە چەند جار ئەو کەسەم بدیبایە کەقەرزاری بووم وام دەزانی هەرئەوکات هاوار دەکات ودەڵێ کواپارەکەم هەرچەند دەنگی نەدەکرد بەلاّم من واهەستم دەکرد (مامۆستا(خ)لەبەینی شەوو ڕۆژێك بوو بەخاوەن سەیارە) هەروەك خۆی دەیووت زۆر لەخەون دەچێ پێش ئەوەی سەیارە بکڕن لەچەند هەفتەیەك جارێك دەهاتنەوە بەلاّم دوای ئەوەی بوون بەخاوەن ئۆتۆمبێل هەموو پێنج شەمەیەك دەهاتنەوە دوای داخستنی

قوتابخانە تاكو هەینی هەرهەفتەو بۆ ماڵی خزمێك. تادووساڵ ئاوا دەژیان كچێكی تریشیان بوو خێزانێكی زۆر بەختەوەروو ئاسودەبوون .
ڕۆژی پێنج شەمەبوو(خ)بەیانی زوو هەڵسا لەخەو بانگی منداڵەكانی كردوەك پێنج شەمەكانی ڕابردوو هەڵسن زوو خۆتان ئامادەكەن دەچین بۆماڵی باپیرە تا لەقوتابخانە دەگەڕێمەوە ئامادەبن خێزانەكەی گووتی من ئەمشەو خەوێكی زۆرناخۆشم بینی (خ)بائەمڕۆ نەگەڕێینەوە بۆ هەولێر زۆر دوبارەی كردەوە بەڵام ئەو هەر دەیگووت خەون كاری شەیتانە ئێمە جارێك و دووان نیە هیچ نەبوە بۆ ئەوجارە وادەڵێی .
دوای دەوام حازربوون بۆڕۆیشتن بەڵام هەرچەند كردی سەیارەكەی كاری نەكرد بەهیچ جۆرێك تەنها سلفیشی نەدەگیرا .خێزانەكەی دووبارە گووتی دیارە خێری تێدایە بیٚ هۆنیە بانەڕۆین بەگوێم بكە ئەوەندە سەركەش مەبە .(خ)ووتی تازە هەردەچم نابیٚ بەگویی شەیتان بكەم بەخەونێك فریوم بدات وەسوەسەی خستۆتە دڵی تۆ سەیارەكەشم كارناكات هەموو كارەكانی ڕێكخستوە باش .لەوكاتە بوو بەدەنگە دەنگی مامۆستایەكی هاوڕیٚ لەگەڵ خێزانی هاوار وشەڕیان بوو هاوسێی ماڵیان و هەروەها هەردوكیان مامۆستابوون كەئەوانیش هەر خەڵكی هەولێربوون كەماوەیەكی كەم بوو هاتبوون بۆ ئەویٚ هێشتا منالیان نەبوو (خ)چوو بۆلایان گووتی ئەودەنگەدەنگ وهەرایە چیە عەیب نیە بۆئێوە كەوا هێشتا هەشت مانگە چونەتە ناو قەفەسی زێڕینەوە ئاوا دەنگتان بێت ؟
هاوڕیٚ یەكەی گووتی دەزانی هەرامان لەسەرچیە خێزانەكەم دەڵی بۆئەوان هەموو هەفتەیەك دەگەڕێنەوە بۆهەولێر خاوەن سیٚ منداڵیشن بۆئێمە مانگی جارێك بچینەوە هێشتامنداڵیشمان نیە ببین بەخاوەن منداڵ ساڵی جارێك دەچینەوە ئێمەش سەیارەی خۆمان هەیە .(خ)ووتی ئەگەر هەراكە هەر لەسەر ئەمەبیٚ هیچ نیە ئەمڕۆ ئێمە سەیارەكەمان كارناكات ئەگەر بەیەكەوە بچین بۆ هەولێر زۆرخۆشتر دەبیٚ (ڕێك كەوتن بەیكەوە بڕۆن) خێزانەكەی (خ)دڵی

زۆرتوندبوو هەرحەزی نەدەکرد ئەم هەفتەیە بگەڕێنەوە بەپیاوەکەی ووت خەونم بینی .سەیارەکە کاری نەکرد.مامۆستاکان لەبەر ئێمە دڵیان حادزبوو. تۆهەر لەسەر عینادی خۆت بەردەوامی کەبچینەوە؟ئەویش گووتی منیش لەبەر ئەوشتانەی ڕویدا زیاتر رشدم لەسەرچوونەوە .

بەیەکەوە بەڕێکەوتن لەڕێگا قسەی خۆشیان کرد زۆرپێکەنین .لەناکاو باسێك کرایەوە لەبەینی ئەم تازە ژن ومێردە(خۆشتان دەزانن شتی وازۆر ڕوو دەدا لەبەینی نووماڵەکان)پیاوەکە سەیارەی لێدەخوڕی ئەمیش لەدواوە بوو . بووبەشەڕیان تادەهات هەرایەکەیان زیادی دەکرد(خ) لەگەڵ خێزانەکەی هەر وایان دەکرد بەینیان چاك بکەن ومەسەلەکە هێور کەنەوە بەلاّم هیچ گوێیان پێنەدەدا دەیان گوت لەکاتی لێخورین ئەم هات وهاوارە باش نیە لادە بۆلایەك بوەستە ئەویش دەیگووت من چەند زووتر بگەم بەماڵی خەزورم باشترە بەڵکوو ئەم بەلاّیە لەکۆڵخۆم بکەمەوە ئاوانابێ ژیان ئاوا ناگوزەرێ تەمەنێکی دوورو درێژ چۆن دەتوانین وابژین من ناوێرم قسەی لەگەڵ بکەم دەیکا بەشەڕوهەرا. گەیشتن بەلۆفەکانی مصیف هەرای ئەم ژن وپیاوە مامۆستایە بەردەوام بوو تابوو بە پاڵدان و لێکدان ژنەکە لەپشتەوە چاکێتەکەی رادەکێشا دەیووت ڕاوەستە من لەگەڵ تۆناچمەوە من ڕێگا پێدەزانم خۆم دەڕۆم (خ)وخێزانەکەی سەریان لێشێوابوو لەبەینیان دەیان گووت کاکە وانابێ خوشکم ڕاوەستە . ئەوانیش هەربەردەوام بوون لەناکاو سوکانی سەیارە لەدەستی وەریگرت وسوڕاوهەردێرا وکەوتە بەرتەقلە . خودایە کەس کارەساتی وانەبینی . بەزویی گواسترانەوە بۆنەخۆشخانە (مامۆستا(خ)مرد لەگەڵ کوڕەکەی تەمەن٥ساڵ وکچەکەی تەمەن٣ساڵ)بەلاّم خێزانەکەی زۆربەسەختی برینداربوو ئەویش دووای هەفتەیەك گیانی سپارد لەم خاووخێزانە تەنها کچە تەمەن ٤مانگیەکە مایەوە هەروەك داپیرەی دەڵی بۆخەمان هەرچەند سەیری دەکەم ئاگرم لەناخدا هەڵدەگیرسێ .

ئەوەی سەیرە لەم ڕووداوە ئەوەیە کەئەم ژن ومێردەی کەبونە سەبەبی ڕوداوەکە کەمێك بریندار بوون دوو سێ ڕۆژ لەنەخۆشخانە مانەوە ئێستاش هەرلەو دێ یە مامۆستان. براکانی (خ)پاش ماوەیەك دوای تعزیەکە چوون ماڵ وکەلوپەلەکانیان هێنایەوە لەدێیەکە گووتیان وامان زانی سەیارەکە دەبێ بەڕاکێشان بهێنینەوە کەچیی بەیەك سلف کەوتەکار تا گەیشتینە هەولێریش هەرنەکوژایەوە!

هەموو ناسیاوەکان دەڵێن ئایە ئەم هەجەل وو قەزاو قەدەربوو !چی بوو. هەرخودا خۆی دەیزانێ.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ صدق الله العظيم ﴿البقرة﴾

واتا {حەق وڕاست هەر ئەوەیە کەلەلایەن پەروەردگارتەوە پێت ڕاگەیەنراوە، نەکەی لەڕیزی ئەوکەسانە بیت کە گومان ودوودڵ(بۆ خەڵکی) دروست دەکەن}ت،ئا.



## بابەتی پێنجەم

# مردن چیە؟ چۆن دێت؟ کەی دێت؟چیت بۆئامادەکردوە!

(ماهو الموت؟كيف ياتي؟ومتى ياتي؟ماذا اعددت له)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ

غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٣٤) صدق الله العظيم ﴿المائدة﴾

واتا {جگە لەوانەیان نەبێ کەتۆبە دەکەن پێش ئەوەی دەستی ئێوە بیانگاتێ ئەوە بزانن کەخوا لێخۆشبوو میهرەبانە(ئەڵبەتە ئەگەر ماف خەڵکیان بەسەرەوەنەبێ} ت.ئا.

تاکوئەوساتەی تیایدادەژی ئایا چەندبیرت لەم ئەرکە قورسە کردۆتەوەکەوا مردنە. کاتت بۆی تەرخان کردوە ئایا ڕۆژی جارێك هەفتەی جارێك مانگی جارێك تەنها ساڵێ جارێك بیرت لێکردۆتەوە چ ئەرکێکت لەسەر شانە. باشە بۆدواڕۆژ کەگەڕایتەوە بارەگای خودا چۆن وەڵام دەدەیتەوە شانازی بەکردەوەکانت دەکەیت یان شەرمەزاری بەکردارەکانت. چاك بزانە تۆهەرچەند لەئازارو ناخۆشی وخەمەکانی ژیان ڕابکەیت ناتوانی لەمردن ڕابکەیت هەبوون ونەبوون وخەمەکان وئازارەکان هەمووی کاتیەهەرچەند زۆریش بمێنیتەوە کاتێك دێت دەڕوات ولادەچێت. بەڵام ئەوەی کەهەمووماں دەیزانین کەوا مردن نەدەڕوات نەکاتیشی بەسەر دەچێت زۆرجارش بێ لەدەرگادان سەردانی ئازیزانمان دەکات بەڕوداوی کتوپڕو لەناکاو. نەخۆشی کاتی مردنی ئازیزان و دۆستانت ومردن وکۆچ کردنی خزم و جیرانت ئاگادار کەرەوەیەکە بۆمردنی تۆش .سەیرکەن بچووك شوێنی گەورە دەگرێتەوە منداڵ جێگای باوکی

دەگرێتەوە بەهێز جێگای بێ هێزدەگرێتەوە دونیا دەوران دەورانە بزانە دونیا بۆتۆش نامێنێتەوە!دڵت بەدونیا خۆش نەبێ بیری مردنت هەردەم هەبێ.ئەوەی مــردن لــەبیر بکــات لــەخودا غافڵــە زۆریــش هەڵــەدەکات .بزانــە هــەروەك (جـابر)روایــەت دەکـات لـە پێغەمبـەری نازدارمـان درودی خـوای لەسـەربێ دەفـەرموێ( هەمووکـەس لەسـەر ئەوحاڵتـە زینـدوو دەکرێتـەوە کەلەسـەری مـردووە)صـحیح موسـلم ص(٩٧٧)هـەروەها دەفـەرموێ(خـوای باڵادەسـت دەفـەرموێ بەسوکترین کەسـی ئـەهلی دۆزەخ لـەئازاردان . ئایا هـەموو ئـەوەی لەدونیایە هـی تۆبوایـە دەتـدا لەتۆڵـەی ڕزگاربوونت؟ئەویش دەڵـێ :بەڵێ.خوای گەورە دەفەرمووێ من لەوە سوکترم لێداواکردی بەلأم نەتکرد) بالەئێستاوە لـەم ڕۆژە بترسین کەئێستا کـات مـاوە بـۆی هەیـە ئـەم کاتـەت بۆنـەگونجی دووبـارە ئەومەجالە نەیەتەوە کەبەوردی چاوێك بەڕابردوو بخشێنیتەوە لـەوەی کـەبۆتان دەمێنێتەوە بۆدونیاکەی تر. زۆران هـەن دەڵێن خودا بەبەزەییـە .ڕاستە خودا بەبەزەییــە عبدللــەی کــوڕی قــیس لەپێغەمبــەر درودی خــوای لێبــی بۆمــان دەگێڕێتــەوە دەفـەرموێ(کـەس لـەخودای گـەورە بـەئارامتر نیەبەرامبـەر وشـەی نـاڕەوا کەبیبیـستێت ،خـەڵك شـەریك بۆخـودا بڕیـاردەدەن کەچـی ئـەو لەگـەڵ ئەوەشدا ڕزق وڕۆزیان دەدات ولەش ساغیان دەکات)صحح مسلم ص ٩٦٦

ئەوەی لەدوای مردوو دەمێنێتەوە کاری چاکە ویادی بەخێرە چونکە بیستمان کەفلأن کەس چەند ماڵ ومیراتی جێ هێشت بەلأم نەوەی باش نەبوو لـەجیاتی ڕەحمەت گوناهی بودەچێت کەس لەگۆڕەکەیشی لیی ڕازی نیە کە دەڵێن مرۆڤ کەمرد شەیتان دەستی لیدەشوات بەلأم ڕەفتاروو کردەوەکانی خۆی دوای خۆی وای لێکردوە پاش مردنیشی بەخراپـە بـاس بکرێـت کەپێغەمبـەری ئازیزمـان دەفـەرموێ درودی خـودای لێبـێ(ئینـسان کـەدەمرێ سـێ لەگـەڵی دەچـن بـۆ گۆرسـتان(١)خـزم وکـەس وکـاری(٢)مـاڵ وسـامانی( ٣)کردەوەکـانی دووانیـان

دەگەڕێنەوە کەس وکاری ومالی دەگەڕێنەوە تەنها کرداری دەمێنێتەوە و بەکەڵکی دێت)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَٰهُ وَجَعَلْنَا لَهُۥ نُورًا يَمْشِي بِهِۦ فِي ٱلنَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُۥ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَٰفِرِينَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ صدق الله العظيم ﴿الانعام﴾

واتا {ئایا ئەوکەسەی کە(وەك)مردوو وابوو،ئێمە زیندوومان کردەوە(بەنوری ئیمان وقورئان)وەنوورو رووناکیەکمان پێ بەخشی کەلەژیانیدا لەناوخەڵکی پێی دەڕواو هەڵسوکەوتی پێ دەکات(هاندەریەتی بۆهەموو چاکەیەك،وەدەیگێڕێتەوە لەهەموو خراپەیەك)(ئایائەوکەسە)وەکو ئەوە وایە کەلەتاریکستاندا گیری خواردبێت وسەری لێ دەرنەکات،(لەگەڵ ئەوەشدا)ئابەو شێوەیە(کەدەبینرێت)کارو کردەوەی (ناپەسندی)بێ باوەڕان بۆیان ڕازێنراوەتەوەو(دڵیان پێی خۆشە)،}ت،ئا. هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾ وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِى ٱلْعُمْىَ وَلَوْ كَانُوا۟ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ صدق الله العظيم ﴿يونس﴾

واتـا {(لـەوبێ باوەڕانـە) کەسـانێ هەیـە گـوێ هەڵـدەخات(کـاتێ کـە قورئـان دەخوێنیـت، بـەڵام ئایـا تـۆ دەتوانیـت قـسەو گوفتـاری خـۆت بـدەی بـەگوێ کەسێکدا کە کەڕولاڵە وهیچ تێناگا وعەقڵی ناخاتە کار} {هەشیانە سـەرنجی تۆ دەدات ولـە هەڵـسوکەوت وگوفتـار وڕەفتـاری تـۆ ورد دەبێتەوە،بـەڵام ئایـا تـۆ هیدایـەتی کوێرونابینـا دەدەیـت؟! ئەگـەر کوێراییـان داهـاتبێ ونـەبینن؟(دیـارە کەئەوانە دڵیان کوێرەو دەروونیا تاریکە ونایانەوێت نوری یمان دڵ ودەرونیان روناك بکاتەوە)} ت.ئا،



# خێرکردن بە گیانلەبەریش صەدەقەیە

ڕۆژێك پیاوێك بەیانی زوو لەماڵ دەردەچێ بەنیازە نانی گەرم بکڕێت . دەچێت بۆ فرنی ماوەیەك لەسەرە دەوەستێ تا نانەکە وەردەگرێت و ڕێگای ماڵ دەگرتەبەر. بەلاّم تووشی هەندێ منداڵ بوو بەردیان لە سەگێك دەگرت . سەگەکەلەبەر ئازار و لەبرسان نووسکەی دەهات . منداڵەکانی دەرکرد سەیرێکی سەگەکەی کرد بەزەیی پێهاتەوە نانێکی گەرمی پێدا دیاربوو هێشتا برسی بوو نانێکی تریشی دایی .ڕۆیشت بەرەوماڵ .چەند ڕۆژبوو بارانێکی زۆر باریبوو ئاوی ڕووبارەکە زۆری کردبوو ئەویش لەقەراغ ڕوبارەکە دەڕۆیشت لەناکاو قاچی هەرخلیسکاو کەوتەناو ڕووبارەکە زۆرهاواری کرد بەلاّم کەس ئاگادار نەبوو ڕووبارەکە بەتین بوو هەرچەند هەوڵی دا خۆی بگرێ بەقەراغێك بەشتێك نەیتوانی . کەنەگەڕایەوە بۆماڵ دوای سعاتێك دووان هەڵسان بەگەڕان بەدوایدا .

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَـٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ صدق الله العظيم ﴿النمل﴾

واتا:{ئایا کێیەجگە (لەزاتی پەروەردگار)کەدەبێت بەهاناو هاواری لێقەوماوو بێ، کاتێك کەنزادەکات ولێی دەپاڕێتەوە،ئەوسا بەلاّوناخۆشیەکانی لادەبات ودەتانکاتە نیشتەجێ وجێنشین لەزەویدا، ئایا ڕەوایە لەگەڵ ئەوزاتەدا خوای تر هەبێت؟ کەمێك یاداوەری وەرگرن وتێفکرن وبیربکەنەوە}ت.ئا

لەم کاتە کێ فریای دەکەوێت کەکەس ناشزانی چی لێهاتوە. دوای گەڕانێکی زۆر هیچ ئاسەوارێکی دیارنەبوو لەئاوای پاش شەو وڕۆژێك لەئاوایەکی دی لە ڕۆخ ڕووبارەکە خەڵکانێك دۆزیانەوە بەزیندویی .هەواڵیان نارد بۆبنەماڵەکەی

کەوا فلان کەسمان دۆزیوەتەوە کەوتبوە ناو رووبارەکە کەئێزە بەدوای دەگەڕێن،بیست وچوارکات ژمێری پێ چووبوو. خزم وکەس وبنەماڵەکەی بەپەلە چوون بۆ ئەوێ !گووتیان بۆمان باس بکە ڕوداوەکە چۆن بوو چۆن کەوتیتە ناورووبارەکە ؟چۆن ئەوهەموو کاتە لەناو ئاوەکە بەزندوویی مایتەوە چۆن نەخنکای؟کەس تۆی نەبینی کەوتبێتیە ئاوەکە بەدوات دەگەڕاین کەچی نەمان دەزانی تۆ لەناو ڕووبارەکەی ؟ئەوەی کەسەیرە تۆچۆن هێشتا زیندوی؟هەریەك لەلایەك پرسیاری دەکرد ببوو بەپرسیارو سەرسوڕمان.

پیاوەکە دەستی کرد بەگێڕانەوەی ڕووداوەکەی کەلەماڵ دەرچووەو چی کردووەو چۆن کەوتۆتە ناو ڕووبارەکە خامۆشی و بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو دانیشتوان داگرتبوو دەیان ویست نەسەرهاتەکە بەتەواوی ببیستن. ووتیان ئەی لەناوئاوەکە چۆن مایەوە ڕۆژێك وشەوێك؟

ووتی ئەم کاتانە زۆرسەخت بوون کەدەکەوتەمە ژێر ئاوەکە دەمگووت کۆتای ژیانمە لەناکاو نانێك دەهاتە ناو دەمم هیچ مەجالی نەدەدا ئاوەکە بێتە دەممەوە چەند جارێك و دەیان جار ئەم نانە ڕێگای بەئاوەکە نەدەدا بچێتە دەمم وبخنکێم . من ئێستاش سەرم سوڕماوە کەمن چۆن نەخنکام. هەموو دانیشتوان اللەاکبریان کرد ئای خودا چەند بەڕەحمە نانەکەی دات بەسەگەکە نۆی ڕزگار کرد لەئاوەکە .!

ئێستاش دادەنیشن لەلای داوای لێدەکەن بۆیان بگێڕێتەوە بەسەرهاتەکەی کەچەند ساڵ بەر لەئەمڕو بەسەری هات .کەبەخۆی دەڵێ هەرچەند کاتی بەسەر دابڕوات وادەزانم دوێنێ بوو.

## (پاشاو پیاوەپیرەکە)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاءَ إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ ۖ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ﴿٢٧﴾ صدق الله العظيم ﴿السجدة﴾

واتا: {ئایا ئێوە نابینن کەچۆن ئێمە ئاوکێش دەکەین ودەیبەین بۆ زەوی وزاری وشك وبێ رووەك، وە(بەو ئاوە) رووەك و گژوگیا دەردێنین کەمالاًتیان و خۆشیان ئێی دەخۆن، ئایائەوە نابینن وسەرنج نادەن}ت،ئا.

ڕۆژێك پاشایەك لەگەڵ داروو دەستەکەی بۆسەیران و هەوەس لەشارەکەی دەسوڕایەوە. چاوی بە پیاوێکی پیر کەوت تەمەنی نزیکەی هەفتا (٧٠)ساڵ دەبوو دار خورمای دەچاند . پاشا لیی چووە پێشەوەو گووتی سەلام مامە ؟ ئەویش نەیزانی پاشایە بەلاًم زۆر بەجوانی جوابی دایەوە .پاشا گووتی مامە بەو تەمەنەت خەریکی چی بۆ خۆتماندی دەکەیت؟ ئەویش ووتی خەریکم داری خورما دەڕوێنم. پاشا گووتی باشە لەماڵ ئیسراحەت کەی باشتر نیە خۆت بۆماندوو دەکەی لەکاتێك دەزانی تا ئەو دارخورمایانە بەر دەگرن تۆمردووی چونکە تەمەنت گەورەیە خۆت باش دەزانی خورما شەست تا هەفتا(٦٠~٧٠)ساڵ بەرناگرێت و لیی ناخویت؟ مامە پیرەکە ووتی : کوڕم دەزانم تائەوکات دەمرم و لیی ناخۆم بەلاًم من بۆخۆمی ناڕوێنم بەڵکو بۆمنداڵەکانم ومنداڵەکانت . پاشا ولاًمدانەوەکەی زۆر بەدڵ بووگووتی من پاشای شارم بۆیە خەلاًتت دەکەم ئافەرین ئەی پیاوی پیر (سەد)لیرەی پێدا خەریك بوو دەڕۆیشت سەیری کرد پیاوە پیرەکە پێدەکەنێ. پاشا گووتی بەچی پێدەکەنی؟ کووتی پێش کەمێك من ئەودارخورمایانەم دەچاند لەدڵ خۆم دەمگووت خودایە پیاو چاك وخەڵکی باش لیی بخۆن کەتۆش هاتی گاڵتەت

پێکردم کە بەم تەمەنەم خەریکم خورما دەڕوێنم پێت ووتم بەرەکەی ناخۆم کەچی منَ هێشتا لە چاندنیان نەبومەوە بەرەکەیم خوارد، پاشاش زۆر پێکەنی سواری ولاغەکەی بوو ڕۆیشت دوور کەوتەوە ئاوڕێکی دایەوە بینی دووبارە پێدەکەنیٚ پاشا گووتی وابزانم گاڵتە بەمن دەکات کەبەخۆڕای سەدلیرەم پێدا.گەڕایەوە لای هاواری کرد تۆ گاڵتە بەمن دەکەی واپێدەکەنی. ئەویش گووتی حاشا من چۆن بەتۆ پێدەکەنم بەلاّم شتێکم هاتەوە یاد بۆیە خۆم بۆڕانەگیرا پێکەنیم. پاشاووتی حەزدەکەم منیش بیزانم .کووتی پاشام خۆشبیٚ بەیانی کەلەماڵ دەرچووم بەشەڕوو هەرا دەرچووم خێزانەکەم رکوڕەکانم گووتیان تۆ شێت بووی خورما دەڕوێنی؟ئەگەر بچمەوە بۆماڵ دەبیٚ چیبکەن کەباسەکەیان بۆبگێڕمەوە .پاشا ئاخێکی هەڵکێشا وگووتی ئەگەر وەڵاتەکەمان لەسەدا دەی وەك تۆ بیربکاتەوە کەخێرێك لەدوای خۆی جیٚ بێڵی وولاّتمان ئاوەدان دەبێت پێشکەوتوو دەبێت بەلاّم من لەڕۆژێك دەترسم کەئادەمیزاد بۆخۆی هەولٚ نەدات نەوەك بۆنەوەکەی ڕۆژێك دێت هەموو هەولی تەنها بۆ خۆیەتی لەبەرئەوە من دووبارە سەد لیرەی ترت پێشکەش دەکەم وەهیچ پەشیمان نیم کارەکەت تەواو بکە بڕۆ بۆماڵ دڵیان خۆشکە بلی لەگەڵ چاندنی خورماکان خودای گەورە دووبەری کردە قسمەتم چوونکە ئەوەی لەخودا غافڵە کافرە.وفي سمأء رزقکم وماتوعدون.



## (خێرو چاکە وون نابێ)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّۦنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ (١٧٧) صدق الله العظيم ﴿البقرة﴾

واتا {چاکەو چاکەکاری وخواناسی بریتی نیە لەڕووکردنە ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوا، بەڵکوچاکە بریتیە لەوکەسەی کەباوەڕی هێناوە بەخواو بەڕۆژی دوایی وبەفریشتەکان وکتێبەکان وبەپێغەمبەرەکان،هەروەها ماڵ وسامانی دەبەخشێ، هەرچەندە خۆشەویستە، بەخزمانی وبەهەتیوان وهەژاران وڕێبواران وئەوانەی کەداوای دەکەن بەناچاری،وەبۆ ئازاد کردنیگەردنەکان لەبەندەیی،هەروەها نوێژەکان بەچاکی ئەنجام دەدەن، وەزکات لەماڵ وسانی دەردەکات،وەهەر پەیمانێك ببەستی وەفای پێ دەکات ،وەئەوانەش دەگرێتەوە کەخۆگرن ولەکاتی نەداری وهەژاری ونەخۆشی وناخۆشی وکاتی شەڕوشۆڕدا،ئائەوکەسانە ڕاست دەکەن وهەر ئەوانەن پارێزگارو خواناس ودیندارەکان،} ت،ئا.

پیاوێکی دەوڵەمەند مرد خێزانەکەی و تەنها کوڕێکی دوای خۆی جێهێشت ناوی(ب)بوو. زۆر دەوڵەمەند بوو ماڵ وسامانی بەژمار نەدەهات(نەخشەبێ لەهەموو موسڵمانێك خوا بەڕەحمەت بیداتێ)پاش تەواو بوونی پرسەکە بەچەند ڕۆژێك وەسیەتەکەی درایە کوڕەکەی للایەن پارێزەرەکەی باوکی . ئایا چی

تیانوسراوە؟ ! هەرکەخوێندیەوە داماو سەری سوڕما لەنوسراوەکە چونکە بەدڵی نەبوو ئەوەی نوسرابوو. لەبەر ئەوە بوو کەچۆن باوکی تائێستا کارێکی وایکردوە وئەوپێی نەزانیوە ڕوی لەپارێزەرەکە کردوو گووتی ئەوە ڕاستە ؟ ئەویش گووتی بەڵی وایە من ئاگادارم هەروەها دایکت ئێمە تاکە کەسین کەبەوە دەزانین. (ب)گووتی کەوایە من ئاخیر کەسم بەوەدەزانم . بەدایکی گووت ئەمە ڕاستە؟ دایکی گووتی بەڵی ڕاستە کوڕم باوکت مانگانە زیاتر لە(١٥) پانزە خێزانی کەم دەرامەتی کۆمەك کردووە . کوڕەکەی ووتی دایە باوکم لەوەسیەتەکەی نوسیویەتی کەمن دەبێ لەسەر کارەکەی ئەوبەردەوام بم نوسیتی دەبی هەموو سەری مانگان کۆمەکەکانیان وەك خۆی بگاتەدەستیان.
دایکی ووتی بەڵی ئەوەش دەزانم .
(ب)گوتی من بۆ وابکەم ئەم کارە چ فایدەی منی هەیە.
دایکی: ڕۆڵەگیان باوکت چەند ساڵە لەسەر ئەم خێرکردنە بەردەوام بوو تۆش دەبێ تەواوی بکەی ڕۆڵە باوکت دەیگووت من کە کەسێکی هەژاروو شایستە بۆ لیستەکەی خێرکردنم زیاد دەکەم دەزانم ماڵم زیاد دەکات ئەوکات دەزانم کەخودای گەورە خێرەکەمی وەرگرتوە ئەوکات هەست بەخۆم دەکەم کەئەوەی دەیکەم ڕیایی نیە چونکە بەدەستی خۆم بۆیان دەبەم وەتا ئێستاش ئەوانەی یارمەتیان دەدەم نازانن من کوێم وەچ کارەم. بۆیە کوڕم نەکەی ڕێبازی باوکت وون کەی؟ دایکە چ جۆرە قازانجێك لەماڵ بەفیڕۆدان هەیە ئەوکارەی باوکم کردویەتی ماڵ بەفیڕۆدان نەبێ چیە. دایکی ووتی کوڕم خودای گەورە ئەم ماڵەی دایە باوکت چونکە لەناخەوەباوکت پاك بوو دەیزانی ئەوماڵە تەنها بۆخۆمان نیە ماف هەژاروو پەکەوتەو هەتیووبێوەژنیشی تێدایە لەبەر ئەوە کەمی نەدەکرد هەرچەند زیاتر ببەخشیبا، نەکەی کوڕم ماف کەس نەخۆی دوای زەرەر دەکەی ئەوکات پەشیمان بوونەوە داد نادات؟

شـەیتان بـاڵی بەسـەر داکێـشابوو .دەیگـووت ئـەوپارەی بـاوکم بەولاوئـەولای بلاوکردۆتـەوە بۆخۆمـان بـێ باشـترە کـەس نـازانی زەمانـە چـی بۆحەشـار داویـن ئەگەر نەهاتی ڕوی تێکردین بچین لـەدەرگای ئەوانـە بدەین کەئێـستا یارمـەتیان دەدەین . ڕۆڵـە شـەیتان بەنەعلـەت کـە فریـوی داوی نـەبی کـوڕم بـەگوێ شـەیتان نەکەی .هەرچەند هەموو ڕۆژێك بەردەوام پێ دەووت هیچ فایدەی نـەبوو. تـاوای لێهـاتبوو دایکـی زۆربێزاربـوو ووتـی پـارەی باوکتـە کـەی پـارەی خـۆت هـەبوو خێری پێ مەکە بەڵام ئەو لەسەر عینادیەکەی بەردەوام بوو.
کاتەکان ومانگەکان تێپەڕ دەبوون ساڵێك بەسەر کۆچی باوکی تێپـەڕی حیـساب و ژمێریاری سامانەکەی کرد سـەیری پێهـات مـن زەرەرم نـەکردوە مانـدوبونێکی زۆرم کردوە بەدرێژایی ئەم ساڵە ئەی بۆچی کەمی کردوە ووتـی دەبـێ بـزانم بـۆ؟ دیــارە مــن دزیــم لێــدەکری وئاگادارنیمــە . زۆران لەکاربەدەســتەکانی لێــی حادزبوون و دڵیانی شکاند. بۆساڵێ دووەم پاش مردنـی بـاوکی هـەمان زەرەری کـرد . زۆر خــەمباربوو هەرچــەند حیـساباتی دەکـردەوە دووبـارەو سـێ بـارە هەرکـەمی دەکـرد . بـەدایکی گـووت مـن هـەر قـازانج دەکـەم کـە سـەرنج دەدەم وژماریان دەکەم زۆر کەمی کردووە نازانم چۆن دایکە خەریکە شێت دەبم نـازانم چیبکەم ؟ ئـەویش گـووتی تۆکـاری خـۆت باشـتر دەزانـی لـەمن بـۆپرس بـەمن دەکەی ئێمە لەم بارەوە پێشتر قسەمان کردوە .
شەوخەونی بەباوکی بینی سـەیریکرد زۆربـەماتی دانیـشتووە چـوەلای گـووتی باوکـە مـن هەرچـەندە خـۆم مانـدوو دەکـەم هـەوڵ دەدەم قـازانج بکـەم بـەڵام هەرزەرەر دەکەم ؟
باوکی ووتی ئاخ کوڕم منیشت ناهومید کرد قازانج کردن بەڕاکردن وخۆمانـدوو کـردن نیـە. مـن ئیتربەرگـەی ئـاخ وئـۆف ئەوخەڵکـە نـاگرم کەمانگانـە کۆمـەکم دەکردن بەپشتیوانی خودای گەورە. (ب)باوکە من هەردەم سەرلێشێواو دڵتەنگم هەرچەند هەوڵ دەدەم بەختەوەر نابم کارم باش نابێ نازانم چیبکەم ؟

ڕۆڵـەگیان خۆشـی وناخۆشـی زەرەروو زیـان مـالْ وسـامان هـەموو ئازارەکـان ودڵخۆشکەرەکان تەنها لەلایەن خودای بالادەستە. بەڕوحمی ئەو ماڵەکەم زیادی دەکرد هەرچەند لەلیستی هەژاران خێزانیکم زیاد دەکرد ماڵەکە زیاتر دەبوو تۆ وات زانـی مـن پارەکـەم بـەبازوو شـانی خـۆم پەیـداکردوە کەترسـای کـەم کـات لەگەڵ بەخشین زۆرهەڵەبووی وەزۆرنـەزان .تۆئێستا چاك دەزانـی ئـەم دووسـاڵە چەندت زەرەر کردوە؟

(ب)بەڵی (........)هەزارەم زەرەر کردوە.

بـاوکی ووتـی کـەی تێدەگـەی کـوڕم ئەوەندەپارەیـە نـەدینارێك کەمترنـەدینارێك زیاترنیە لەوپارەیەی کەمانگانە دەمدایە هەژارەکان .من کۆمەکەکـەم بـۆ دەبردنـە ماڵیان هیچ لەم خێزانانە نەیان دەزانی من کویێم وە هیچ لـەمان ئاگـاداری ئـەوی تریـان نـەبوو هەریـەك وای دەزانـی مانگانـە تـەنها هەرئـەو پـارە وەردەگرێـت . چونکەئەو خێـرەی دەیکـەیت ئەودەسـتەت بەئـەوی تریـان نـەزانی . من زۆرجـار دەم بیـست دەیـان گـووت فـلان کـەس ئەوەنـدە دەوڵەمەنـدە کەچـی کـەس خێـر لەدەسـتی نـابینیْ بـەحالْ دڵـی دێـت زکاتەکـە بـدات کـوڕم ئـەوکارەم بـۆ خـەڵك نـەدەکرد بـەڵکو بۆخـودام دەکـرد چونکە بۆخـەڵك دەبێتـە ریـا وپـۆز لێـدان بـەلام بۆخودا بزرنابێت .

لەخەوەکـە ڕاپـەڕی هـەمووگیانی ببـوو بەئارەقـە دەسـتی بەدەموچـاوی داهێنـا گووتی استغفرلله ئەمە هەمووی ئارەقەی شەرمەزاریە خودایە بمبورە من ڕێگـام بزرکردبوو شـەیتانی پیس فریـوی دام چـوو دەسنوێژی گـرت دوورکـات نویـژی بوخودا کرد زۆرداوای لێخۆشبوونی کـرد قورئانەکـەی بـاوکی هێنایـە خـوارەوە لەسەر تاقیچکەکە کردیەوە ئەوئایەتەی کەوتە بەرچاو.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

إِنَّ ٱلۡمُصَّدِّقِينَ وَٱلۡمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقۡرَضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعَفُ لَهُمۡ وَلَهُمۡ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴿١٨﴾ صدق الله العظيم ﴿حديد﴾

**واتا {بەڕاستی ئەوانەی کەخێر خوازن لەپیاوان وئافرەتان، ئەوانەی کەقەرز دەدەن بەخوا ماڵ و سامانیان لەپێناو ڕەزامەندی ئەودا دەبەخشن، ئەوانە چەند بەرامبەر پاداشتیان دەدرێتەوە وپاداشتی پیرۆزوبەنرخ چاوەڕێیانە}ت.ئا،**

**لەوڕۆژەوە بوو بەکەسێکی تر ئەوخێزانانەی باوکی ناو وناونیشانی نوسیبوو لە وەسیەتەکەی یارمەتیەکانیان بۆچویەوە بەڵکو هەوڵی دەدا ساڵانە خێزانیک زیاد بکات لەلیستەکەی (ب)دەڵی دەبێ منداڵەکانم هەمان ڕێبازی من وباپیرەیان بگرنەوە انشاالله(ئامین)**

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢٥﴾ صدق الله العظيم ﴿الشورى﴾

**واتا: {هەر(خوا)خۆی پەشیمانی وتوبەی بەندەکانی وەردەگرێت، هەروەها چاوپۆشی دەکات لەهەڵەو گوناهەکانیان ، وەبەوکارو کردەوانەش کە ئەنجامی دەدەن دەزانێت وبەئاگایە}ت،ئا.**



## (زەکات نەدان)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾ صدق الله العظيم ﴿ ال عمران ﴾

**واتا {ئێوەهەرگیز ناگەنە پلەی چاکیی وچاکەکاریی هەتا لەوشتانەی کەخۆشتان دەوێت نەبەخشن،هەر شتێکیش ببەخشن خوا ئاگاوزانایە پێی،(لێ ی وون نابێت وبێ پاداشت نابێ}ت،ئا.**

**مام (ر)بەتەمەن بوو تێپەڕیبوو لە هەفتا ساڵ . سەردانی ماڵی خوای کردبوو . بانگیان دەکرد بەحاجی(ر) بەڵام ئەوەی دەیناسی دەیگووت بۆ چۆتە حەج و مەصروفێکی زۆری کردووە نازانین،هەندێکی تریش دەیان گووت تەنها رووکنەکانی ئیمان بەجێ دەگەیەنی تابڵێن پیاوێکی باشە نەوەك هیچ پەیوەندی پتەوی بەئاینەوەنیە.**

**حاجی(ر) بەهیچ جۆرێ خۆی نەدەپاراست لەگوناه وجوێندانی ناشیرین و باسی خەڵك کردن. کاتێك مانگی ڕەمەزان دادەهات موسڵمانان هەموودڵخۆش دەبوون بەڵام ئەو دڵی تەنگ دەبوو دەیگووت زانیمان ڕۆژوەکە مانای وایە خۆمان دەگرین لەنان وئاو باشە ئەم زکات دانە مانای چیە. خوامالی داوە پێم خۆئەگەر بیویستایە بداتە ئەوانیش چۆن منی بینی ئەوانیشی ئەبینی چۆن دایبەمن دەیدابەئەوانیش. زگێك خودابرسی بکات بەماڵ وزکات دانی من تێرنابێ بائەوڕۆ پارەی بدەمێ ئەی بەیانی چی،باشە ئەم پارە بۆخۆمو منداڵەکانم سەرفکەم باشترنیە ،کەئەمڕۆ بیدەمە یەکێ بەیانی لەبیری دەکات وادەزانی هەریارمەتیشم نەداوە .ئەوخەڵکە هەژارە زۆر سپڵەن ئەگەربەیانی من ببینن ڕویان لەولادەکەن؟**

(((وتەیك لەنووسەر: ئەگەر ئەوانەی بەڕاستی زەکات دەدەن بۆڕەزامەند بوونی خودای گەورە ئەوە نیە تۆ هەرماڵێك کەوا زکاتی پێدەدەی دەدینار یان سەد دیناریان پێبدەی ئەگەر زکاتەکەی کەبەنیازی بیدەی بیدەیت بەیەك خێزان تاباری ژیانی ڕاستبێتەوە هیچی تر پێویستی بە یارمەتی نەبێ ڕزگاری دەکەیت لە فەقیری ودەس کورتی و کرێچیاتی زۆرباشترە. خێرکردن وزکات دان دەبێتە ریایی کاتێك بەچەند بنەماڵەیەك درا ئەگەر بۆخودابێ دەبێت ئاوابێت . هەروەك حاجی (ر)ووتی تۆش وامەبە ئەگەر خودا بەتۆی دا نەیدا بەئەو مانای وانیە تۆی خۆشتر دەوێت . بەڵکۆ زۆر جار کەئەوەی ماڵی زۆری هەیە ئەگەر خوداپێنەدابوایە لە هەژارەکە خراپتری بەسەر دەهات.خۆبەزل مەزانە لەبەر ماڵ چونکە دوور نیە بەچاو تروکانێك بیبات ( بکلیمە) واتا خودا بەووتەیەك دەدات بەووتەیەکیش دەبات. باش بزانن))

ڕۆژێك لەگەڵ کوڕەکانی دانیشتبوو .

مام(ر):ووتی باشە منیش هەژارنیم ئەی بۆکەس یارمەتیم نادات.

کوڕەکان : باوکە تۆ ماڵت زۆرە تۆ بۆ وەك ئەوخەڵکە خێر ناکەی بۆ زکات نادەی؟

(م.ر)من دوژمنم لەماڵی خۆمە ئێوە چیدەڵێن .ئێوە بەوماڵە ماندوو نەبوونە حەقتانە وابڵێن .

کوڕەکان : ئێمەش مانووین باوکە بۆخۆت باشدەزانی خەڵك ڕۆژانی هەینی پشوو دەدات تۆنایەڵی هیچ ڕۆژێك ئیسراحەت بکەین پارەکەشمان لەگەڵ ژمار دەکەی وەك منداڵی بچووك سەیرمان دەکەی بابە ئێمە گەورەبووین .

ساڵان دەڕۆیشت ئەوە حاڵیان بوو ئەگەر باسی زکاتیان لەلابکردایە خزموو ناسیاو دەیگووت چۆن دەبێ کاری خێر دوابخرێ من زۆر زوو زکاتم داوە وەك من بن لە خێرکردن!. بەڵام ڕاستی ئەوەبوو کەهیچ زکاتی نەدەدا. ئێوارەیەك

بەکوڕەکانی گووت بەنیازم ئەوخانووەی تەنیشتمان بکڕمەوە . دوای نیوەڕۆ لەلای خاوەنەکەی دانیشتبووم گووتی دەیفرۆشێت ؟

کوڕەکـان : تـۆدەزانی ئـەم خـانووە نرخەکـەی چـەندە زۆرە هـەردەم تـۆدەڵی هیچمان نیەئەم هەموو پارەیە لەکوێ دەهێنی ؟

مام(ر)من نەبەرچی هەردەم ئامۆژگاریتان دەکەم دەڵێم پارە کۆکەنەوە هەر ئەو بەکەڵکتان دێت لەکاتێکی وەك ئێستا ئەگەر من پارەم هەڵنەگرتبوایە ڕومان کردبوایە کوێ کەس پێی دەداین ها؟

کوڕەکان : بەڵام ساڵێك نابێ خانوەکەی ترمان کرێ بەکرێت داوە گوەتت کەس نەزانی ئێستا چۆن بەماوەی ساڵێك ئەم هەموو پارەیە پەیدا بوو بەچی کۆبویەوە !

(ر)ئەوپارەیە چەند ساڵ بەر لەئێستا کۆمکردووتەوە هی ئێستانیە ئەوە نزیکەی هەشت ساڵدەبێ هەڵم گرتووە.

کوڕەکان باوکە نەمان دەزانی تۆش پارە هەڵدەگری لەبەنك؟

ئێوە چی دەڵێن من چۆن پارە لەبەنك دادەنێم من پارەی خۆم لەبەر چاوی خۆم هەڵدەگرم ئێستا کاتی ئەوباسانە نیە تادرەنگ نەکەوتووین بابچین بۆماڵی جیرانەکەمان بزانین ڕێك ناکەوین بۆکرینی خانوەکەی؟

چوون بۆلای هاوسیکەیان پێك هاتن کەخانوەکەی لێبکڕن بەبڕی(٧)دەفتەر بەبەراورد پارەی ئێستا پێك هاتن بەیانی پارەکەی بداتی . بەڵام کوڕەکانی بیریان هەرلەوەدەکردەوە ئەم پارەیەی چۆن وەلەکوێی هەڵگرتووە!

بەیانی زوو کوڕەکانی بانگ کردو گووتی وەرن پارەکە ئامادەکەین بۆ خاوەن خانوەکە. ئەوانی برد بۆلای باخچەکە ووتی وەرن ئێرە هەڵکۆڵن من پارەکەم لەژێر ئەم خاکە شاردۆتەوە . لەکاتی هەڵکەندن دەیگووت من ئەوپارەی هەڵم گرتووە بڕی (٥٠٠)هەزارە(سویسری) دەبێ بۆی تەواو کەین لەوەی لامانە.کاتێك سەیریان کرد تەنەکەیەکیان دۆزیەوە گووتی ئەوە

پارەکەیـە.گووتیـان چـۆن پـارە لەشـوێنێکی ئـاواو لـەناو تەنەکـە هەڵـدەگری هـەمووی ڕزیـووە ! ئـەویش ووتـی مـن والـەناو تەنەکـەم نـەناوە لـەناو کاغـەزوو نـایلۆن ئاڵاندوومـە . ووتیـان باوکـە لەکەیـەوە ئـەم پارەیەلێرەیـە ؟ گووتی چوار پێنج ساڵە. بەڵام کەدەریان هێناو سەیریان کرد چی ببینن لەناو تەنەکە پارەکە هەمووی مۆرانە خواردوویەتی هەرئەوەندەی ماوە کەبزانن ئەوە پارەیە! ووتیـان باوکـە پارەکـە هـەمووی بۆتـە خـۆراکی مۆرانـە ئـەوەی دڵـت نـەدەهات بیکـەی بـەخێروو بیـدەی بەخـەڵك وەك زەکـات خـوای گـەورە بـەهۆی ئـەم شتەبـچووکە بردویەتیەوە.!

(مـام ر)کەئـەوەی بـینی کەوتەسـەر زەوی ئاگـای لـەخۆی نـەما بـەزووی بردیـان بۆنەخۆشـخانە دکتـۆر ووتـی توشـی فـشاری خـوێن بـووە خـەمێکی زۆری خواردوە. لەلای دادەنیشتن دەیان گووت خـەم مـەخۆ پارە دێـت ودەڕوات تـەنها بیری پێمەکەوە تۆسەلامەت بی هەمووشتێکە بۆمان باوکە.

چــەند هەفتەیــەك لەنەخۆشــخانە مایــەوە بــەهۆی ئەمــەوە مــرد (إنا لله وإنا إليه راجعون) دوای شوشتن وکفن کردن بردیان بۆگۆرستان وگۆڕیـان بۆ ئامادەکردبوو خستیانە ناوی کەدایان نا بەرێکی هاتنە دەرەوە تا دایپۆشن بەڵام لەناکاو مارێکی ڕەشی گەورە لەناو گۆڕەکە لەکونێك بەدیار کەوت و خۆی لێی ئاڵاند لەبەرچاوی هەموو خەڵکەکە . کوڕەکانی گووتیان ئێمە باوکمان لێرە نانێژین . دەریـان هێنـاو گـۆرێکی تریـان بـۆی هەڵکەنـد خستیانە نـاوی دیسان هـەر ئـەومارە لەناوگۆڕەکـە بـەدیار کـەوت و خـۆی لـێ ئاڵانـد دەریـان کـرد لـەوگۆرەش منداڵـەکانی دڵیـان نـەدەهات ئاواسـەری داپۆشـن گـۆڕێکی تریـان هەڵکەنـد بـەڵام فایـدەی نـەبوو چوونکە ئـەو مـارە گـەورەو کـەخۆی لـێ دەئاڵانـد کلکی لەقاچەکانی دەئاڵاند تاسەری دەگەیشتە ڕاستی سەری هـەموو لاشـەی لـە لەشی مام(ر)دەئاڵانـد زۆر سـەیریان پێهات ئەوخەڵکە هـەمووی سـەریان سوڕما داوایان لەکوڕەکانی کرد چیتر ئاوانـەی هێڵنـەوە دایبپۆشن چوونکە ئەگـەر هـەر

گۆری تر هەڵكەنن وەئەگەر بیبەن بۆشوێنێكی تر و شارێكی تر ئەم مارە وازی لێناهێنی گووتیان ئەو شتێكی كردوە لەژیانیدا كەئێستا لەبەر چاوی هەموو خەڵك ئەومارە وازی لێناهێنی كەببێت بەدەرس وعیبرەت بۆزیندوان كەئەو چیكردوە بەڵكوو بتوانین هەڵەمان چاك بكەینەوە ؟ باوكتان چ كارێكی نادروستی دەكرد لەماوەی ژیانیدا ؟ ئەوانیش گووتیان ئێمە دەتوانین بۆتان باس نەكەین بەلاَم ئەوەی باوكمان دەیكرد ئێمەش پێمان خۆشنەبوو هیچیشمان پێنەدەكرا ئەوەی ڕاستیبێ ئەو لەژیانیدا زەكاتی نەداوە . هەموو گووتیان لەبەرچی ئەو پیاوێكی دەوڵەمەند بوو چەند خانوو چەند دووكانی دابوو بەكرێ . ئەوكات مەلایەكەی خۆی ئامادەكردبوو بۆ تەلقینی ووتی(ابو هورەیرە رەزای خوای لێبی لەپێغەمبەر درودی خودای لەسەر بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ.دەوڵەمەندی بەزۆری ماڵ نیەبەڵكودەوڵەمەندی ئەوەیە كەدڵ ودەرون دەوڵەمەندبێت) ڕاستی فەرموو پ.ص)ئەوكات دانیان پێدانا كەسودی نیە بۆیە دایان پۆشی .

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ ﴿١١﴾ صدق الله العظيم ﴿ الليل ﴾

واتا {ئەوكاتەی دەمرێت ولەگۆڕ دەنرێت، ئەوكاتەش كەفڕێ دەدرێتە(دۆزەخەوە ماڵ وسامانەكەی هیچ فریای ناكەوێت)}ت.ئا،



## (بابەتی شەشەم)

# (خێزانی ڕێك وخێزانی كەم ئەزموون)

## (العائلة الرزینة والعائلة ذوخبرة قلیلة)

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ صدق الله العظیم ﴿النساء﴾

**واتا: {ئەوەی كە كردەوەی چاكە ئەنجام بدا لە پیاوان وئافرەتان وەئیمان داربێت،ئا ئەوانە دەچنە بەهەشتەوەو بە قەدەر تاڵ ناوكی خورما ستەمیان لێناكرێت} ت،ئا.**

**گرفتی زۆر توشی خێزانەكان دەبێت ئێمە دەمانەوێت هەندێك لەم گرفتانە بەكورتی بخەینەڕوو بۆئەوەی بتوانین خێزانێكی ڕێك پێك بهێنین لەهەموو ڕوێكەوە . زۆر ڕووداوی بچووك لەناو خێزان دەبێتە هۆی گەورەترین كێشە لەكاتی لەیەكتر نەگەیشتن .**

**چەند پرسیارێك ئاراستەی خوشك وبرایانی خێزاندار دەكەم هیوادارم زۆر بەڕاستی وەڵامی پرسیارەكان بدەنەوە لەناختان ڕاستگۆبن تالەگەڵ گرفتەكانتان ئاشنابن بۆئەوەی بتوانن بەباشترین شێوە چارەی بۆبدۆزنەوە .**

**_ تاچ ڕادەیەك ئێوەلەیەكتری تێدەگەن؟**

**تۆ_ برای بەرێز دەتوانی گرفتی دەرەوە لەدەرەوە بەجێبهێڵی نەیهێنیتەوە بۆماڵ كاتێك دەزانی خێزانەكەت ئەو توانایەی نیە بەژداری گرفتەكانت بێت وەلەگەڵ خەمەكانت خەم هەڵگرێت چوونكە قابلیەتی هەموو كەسێك وەك یەك نیە. تۆش كەدەزانی خێزانەكەت وایە زۆری لێمەكە كەبتوانی چونكە ناتوانی**

وەبــەهیچ جۆرێــك بــەراوردی مەكەبەكەســێكی تــر كــەڕاهاتوە شــان بەشــانی پیاوەكەی بوەستێ چونكە مایەی ئازاردانی دڵەو بێشەرم بوونە لەیەكتر .

تۆ_ برای بەڕێز كاتێك دەگەڕیتەوە ماڵ دەس خۆشـی لەخێزانەكەت بكە كاتێك گـۆڕان كاریـەكت بـینی یـان كاتێـك خواردنـت بۆدادەنێـت بڵـی خواردنەكـەت زۆربـەتام ئامـادەكردوە . ئەگـەر واش نـەبوو دەتـوانی لـەكاتی نـان خـواردن بڵـێ تۆزیك سوێرە یان تۆزێك چەورە یان هەرجۆرە كەموو كوڕیەكی هـەبوو بـەجوانی تێبگەیەنـە . نـەوەك بڵێـی جائـەوە خواردنـە ئامـادەت كـردوە هـەموت خەسـار كردوە شێوەی تێگەیاندن چەندە جوانبێ باشترە.

تۆ_ برای بەڕێز ئەگەر ڕۆژێك لەكاتی گەڕانـەوەت خێزانەكـەت تـووڕە و دڵ تونـد دیـاربوو زۆری لێمەكـە بۆئـەوەی بزانـی چیـەتی ئەگـەر جارێكـت پرسـی مەیكـە بەدوو تۆنازانی ئـازارێكی جەسـتەی هەیـە یـان مانـدووبوە لەبـەر كـاری مـاڵ یـان دڵـی بەمندالـەكان توونـد بـووە بێزاریـان كـردوە بـەهاواریان ،زۆرشـتی تـر تـۆ دەتوانی عوزری بۆبهێنیتەوە چونكە ئەگـەر هەنـدێ نـاز لەسـەر تۆنـەكات لەسـەر كێ بیكـات دوای ماوەیـەك خـۆی نـاتوانی بەرگـە بگـرێ هـەمویت بۆبـاس دەكـات بڕوابكە.

تۆ_ برای بەڕێز كەیبوو دواین جار دیاریەكت بۆی كڕیووە من نالێم پارچەیەك زێڕی بۆبكڕە بەڵكوو شـتێكی بچوكیش بێـت بۆنێك ڕەفتەیەك پارچە قوماشێك هەرشتێكی تر لەم بابەتە ئەمە پەیوەندی وتـەبایی و خۆشەویـستی بـەینی ئێـوە زیاد دەكات وای دامەنێ كەپەیوەندی ئێوە ژن ومێردایەتیەو یان تەنها لەسـەرتە كەرستەی ناو مـاڵوو كەرستەی خواردنی بۆبهێنیتـەوە بـاوابیر نەكاتەوە كـەوەك خزمەت كارێك ئەركەكانی جێبەجێ دەكات و هیچی ترنا.

تۆ_ خوشكی ئازیز هەردەم ماڵت پاك و ئامادە بووە ؟یان خـۆت خـەریك دەكـەی بەسـەیر كردنـی تەلـەفیزیۆن ودانیـشتنی بـەردەرگاو خـەوتنی ناوەخـت؟ سـەیر دەكەی واخەریكە كات درەنگ دەكات ئینجا كارەكان دەكەیت وخـۆت مـشەوەش

دەکەیت . کاتێك پیاوەکەت بەماندووی گەڕایەوە سەیر دەکات کۆڵی جل لەحەمامە نازانی چۆن دەست وچاو بشوات خواردن ئامادەنیە تۆخۆت زۆرناڕێکی . جارێك دووان ناچار دەبێ پەنا بباتە بەر خواردنی دەرەوە . واتا خۆت فێرت کرد دوای گلەیی نەکەی کەواپیاوەکەت ڕوو لەدەرە . ئەوەی لەدەرەوە سەرنجی پیاوەکەت ڕادەکێشێ چیە تۆش وابکە تادرەنگ نەبووە بالەدەستی نەدەی دوایی دادنادات هیچ شتێ . بشزانە ووتویانە کاری بەوەختی پاشای سەرتەختی .

تۆ_ خوشکی ئازیز تۆ کاتێك پیاوەکەت گەڕایەوە کەی پێشوازیت لێکردوە بەڕوێکی خۆش وە ئەگەرشتێکی بۆماڵ هێنابێتەوە بۆڕوون کردنەوەی زیاتر بڵێین (دووکیلۆ تەماتە دووکیلۆ سێو) هەرشتێکی تر تاچەند دەست خۆشیت لێی کردوە ئایا زوو نەت ووتوە ئەوە بەکەڵك نایەت . تۆنازانی شت بکڕی تۆواو .تۆوا. هەتاکۆتایی .

ئێوە_ ئایاکاتێك تووشی گرفتێك دێن چەند هەوڵتان داوە وەك دووهاوڕێ بەیەکەوە دانیشن چارەسەری بۆبدۆزنەوە بێ ئەوەی دەنگتان بەرزبێتەوە وحادزی بکەوێتە بەینتان . بزانن لەسەرەتای ژیانی هاوسەری گرفتی زۆر ڕوولە خێزانەکان دەکات بەڵام بەتێپەڕ بوونی کات کەم دەبنەوە چونکە زیاتر یەکتری دەناسن . ئەگەر بتوانن لەکاتە ناسکەکان ولەسەرەتاکان ئاگاداری هەڵسوو کەوتتان بن،ئەگەر یەکێکتان بتوانی خۆڕاگربێت ودەنگ نەکات ئەویتر ناچاردەبێت دوای ماوەیەك ئەویش بێدەنگ بێ بەڵام یەکێکتان ـبن بەئاگر ئەوەیتر بەنزین ئەوکات دەبێتە هۆی دڵ ڕەنجان وحادزبوون. تاتواناتان ببێ مەیەڵن بگاتە ئەو ڕادەیە .چونکە چەپڵە بەدەستێك لێی نادرێت بزانە. بۆکەس نیە خۆی لەگرفتی خێزانی ئێوە بدات زوو لەیەکتر ببورن بەهێمنی چارەسەری خەمەکان وگرفتەکانتان بکەن . کەسانێك بکەن بەمامۆستاو فێرکارتان پرسیان پێی بکەن ئەگەر وای ویست ئەگەرناچاویان لێبکەن بزانن چۆن سەرکەوتوون

پرس بەکەسێك مەکەن کەچارەسەری لانەبێ هەرچەند بەتەمەنیش بێت یان نزیکیش بێت.

ئێوە_ کامەتان نهێنی ئەوی ترتان دادەپۆشن؟ گوێ بیست بوینە زۆرجار دەڵێن ئافرەت زیاتر نهێنی ماڵی دەباتە دەرەوە . منیش دەڵێم لەسەدا ٨٠ی ئەم ووتەیە ڕاستە بەلاّم وەك دەڵێن ژن هەیە ژنۆکەش هەیە هەرووەها پیاویش بەهەمان شێوە هەڵە دەکات. چۆن ؟ ئافرەتم ناسیوە هەردەم لەخۆشی و نازوو نیعمەت دابووە پیاوەکەی فەرمانبەربووە دوای دەوامیش دووکانی دانابوو کاری لە سەر دەکرد چەند ڕۆژێك ئەم پیاوە نەخۆش کەوت کارەکەی دوای دەوامی پێنەدەکرا کەخەڵك دەچوون بۆسەردانی ئەم پیاوە دەیان گووت چۆنی لەجیاتی پیاوەکە ژنەکەی وەلاّمی دەدایەوە دەیگووت چۆن بین واحاڵمان دەبینن چەند ڕۆژە ئەودەکانە داخراوە ئەویش نەخۆشە پێویستی بەدکتۆرو دەرمان هەیە ئەوەی هەمانبوو هەموویمان سەرفکردو تەواوبوو .

ئازیزانم ئەمە!نموونەی ئینسانی لەخوداغافڵە کەبەهیچ جۆری سوپاس گوزاری نیعمەتی خودا نیە بەچەند ڕۆژێك دونیای لێ دەبێتە ئاخر زەمان . چۆن بەراورد دەکرێ بەوئافرەتەی دواتر.

ئافرەتێکی ترلەخێزانێکی هەژار لەساڵەکانی گرانی لەگەڵ دوو خێزانیتر لەخانویەك دەژیان بەکرێ . ئەوان حاڵیان باشبوو خواردنی خۆشیان ئامادە دەکرد وجلی جوانیان لەبەردەکرد بەلاّم خێزانی ئەم ئافرەتە حاڵیان باش نەبوو جاری وابوو هەفتەیەك خواردنیان لەماڵ نەبوو کەچی وای نەدەکرد ئەوانەی لەگەڵیاندان بزانن ڕاستە نەبوونی عەیب نیە بەلاّم دەیگووت خوا تاقیمان دەکاتەوە ئەگەر باسیش بکەم تەنها ناشوکری خۆم دەردەبڕم . زۆرجار هەندێ ئاوی لەمەنجەڵ دەکردوو لەسەر سۆپاکە دایدەنا تانەزانن هیچیان نیە نەوەك بپرسن بۆ هیچت لێنەناوە.

ئێمەچۆن دەتوانین بەیەك چاو سەیری ئەم دووانە بکەین.

ئێوە_ چاو لەسەر یەکتر دامەنێن . واتا دایکت مەکە چاودێر لەسەر خێزانت مندالَت مەکەچاودێر ، مەلێ پەوەندیت بەکوێ کردوە ئەمڕۆ. مەلێ بۆخەمبار دیاری کەسێك هاتوە کەمن لەمالَ نەبووم. تۆش مەلێ لەدەرەوە کوێت دیت. لەگەر فلأنە کچ لەدەوام قسەنەکەی.زۆر نارێك وناشایستەیە تەنها دلَ ئەزێت دانە . ئەوبۆچونانەی کەتۆ هەیتت لەناخت کەهیچ بونیان نیە وادەکات بونیان هەبێ کەزۆر دوپات کرانەوە . هەولَ مەدە خەیالَ بکەیتە ڕاستی،

خانوو ئەگەر بناغەی پتەوو قایم بێ بەهیچ تۆزوو باو گەردەلول و زریان و لافاو دەرزی لێ پەیدا نابێت. خێزانێك بن لەسەرەتای ژیانتان هیچ هەنگاوێك مەنێن بێ ڕەزامەندیێ هەردوولاتان وەك بناغەی خانوو باپتەوبێ بناغەی ژیانی هاوسەریتان، بەهیوام ئەم کێشانەی ئێستالەدادگاکان زۆرن کەم بێتەوە بەلَکوو هەرنەمێنێ (انشاالله)



# (نهێنی پاراستن)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَا تَكْتُمُواْ ٱلشَّهَـٰدَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُۥٓ ءَاثِمٌ قَلْبُهُۥ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾ صدق الله العظيم ﴿البقرة﴾

**واتا: {نەکەن شایەتی بشارنەوە، ئەوەی شایەتی بشارێتەوە ئەوە دڵی ژەنگاوی وناپوختە، خوایش بە هەموو کردەوەکان زانایە} ت،ئا.**

**_ئافرەتێك مرد کەتەمەنی نزیکەی ٦٠ساڵ دەبوو بەڵام هیچ منداڵی نەبوو لە پرسەکەی هەرکۆمەڵە ئافرەتێك چرپە چرپیان دەکرد خۆزگە کوڕێك یان کچێکی هەبوایە باشتر بوو ئەو لەولاو ئەویتر لەولاهەریەك بەجۆرێك قسەی دەکرد.خوشکی مردوەکەش لەگۆشەیەك دانیشتبوو هەر سەیری دەکردن و گوێی بۆڕاگرتبوون. تاکاتێك (دشی)خوشکەکەی واتا (خوشکە مێردی مردوەکە)ووتی ئاخ براکەم خوالێت خۆشبێ زۆرمان پێ گووتی بۆخۆت ژن بێنەوە کەچەند ساڵێکی پێچوو هەر منداڵی نەبوو بەڵام بەگوێی ئێمەی نەکرد . زۆری باسکرد هەرتەواونەبوو (جام پڕبێت لەسەری دەڕژێت)خوشکی مردوەکەخۆی بۆڕانەگیرا ووتی:بەسە تاکەی بێدەنگ نابی خوشکم مردیش تۆهەر وازی لێناهێنی بەدەم گریانەوە ووتی کەس وەك خوشکەکەی من زوڵم لێکراوو فەقیر داماو نەبوو خوایە ئەم زوڵمە هەڵنەگری کە ماڵی خەزورانی لێیان کرد .**

**(دشی)خوشکەکەی ووتی:ئێمە چیمان لێی کردبوو بەس نیە براکەم بێ دڵی خۆی کرد لەهەمووژیانی وەك خەڵکانی تر منداڵێکی هەبێ بەنائومێدی سەری نایەوە دڵی نەهات ژنێکی تر بێنێ بەسەر خوشکەکەت خۆی بێبەش کرد لەووشەی باوکە هەرلەبەر نەزۆکیەکی خوشکت نەبوو بۆ ڕاستی ناڵێی ؟.**

خوشکی مردوەکە گووتی زیاتر بەرگە ناگرم نازانم خوشکم چۆن توانی ئەوەندە ساڵە بەرگەی قسە ناشیرین ونابەجێیەکانتان بگرێت تۆبەویستی خۆت دەڵی ڕاستی بڵێم نەوەك من ٤٠ساڵە بەڵێنم بەخوشکم داوە کەقسە نەکەم سوێندم بۆی خوارد بەلاّم تۆ هیچ شتێکت تیادا نەهێشتەوە لەبەر چاوی ئەو هەموو خەڵکە ئەوەی هاتە بەر دەمت نەتگێڕایەوە .

گوێبگرن هەمووتان ئەوەی لێرەدانیشتوە بزانن خوشکی من چ ئافرەتێك بوو کەبەهەمووتان تەحەمولی ئەوەتان نەدەکرد تەنها مانگێك لەئەوەی ئەو بەرگەی گرت لەژیانی .بۆ ڕاستی ودروستی قسەکەشم من خۆم کەتەنها نەمتوانی ئەوسێ ڕۆژەی پرسەکە تەواو دەبێت خۆڕاگربم. ئێمەش گەنج بووینە دەزانین گەنجیاتی چۆنە مانای وایە هیواو ئاواتی زۆرمان هەبووە خوشکەکەی منیش خوالێخۆشبێت هەمان ئاواتی هەبوو کەببێ بەخاوەن خێزان ومنالێ بەلاّم!بۆئەو بووبەخەون چونکە زوو زانی کەپیاوەکەی (.) بەڵێ مندالّی نابێ لەسەرەتای ژیانی هاوسەری ئەوەی بۆڕوون بۆوە. من لەبەر قسەی ئێوە واتە (ماڵی خەزورانی)ڕۆژێك بەزۆرێ گووتم دەبێ بڕۆین بۆلای دکتۆر ئەویش چاری نەماهەمووی بۆباس کردم پێم گووت باشە بۆ ڕازی بەم ژیانە پیاوت وابێ خزمەکانیشی هەر لۆمەی تۆبکەن ئەوە چۆن ژیانیکە گوتی خوشکەگیان ژن ومێردایەتی تەنها جێگەی خەوتن نیە من ڕازیم بەبەشم خۆی زۆرجار داوای لێکردووم کەجیاببینەوە ئەویش زۆربێزار ببوو لەقسەی خەڵك گووتی من ڕازیبووم ژن بێنم تەنها تاخەڵك بە کەمووکوڕیم نەزانێ گووتبووی من بڕیارم دابوو دوای ماوەیەك بڵێم نەگونجاین بۆیە جیا بووینەوە خوشکیشم تاناوی ناشیرن نەبێ بڵێن (تەلاّق) دراوە ئەوەی قەبوڵ نەکرد . دڵیشی نەهات براکەت بشکێنێتەوە لەبەرچاوی ئێوە. هەموو ئازارەکانی هەڵگرتت کەئەتانگووت مندالّت نابێ تۆ وای تۆ وای. دوای ٤٠ ساڵ ژیانی هاوسەری خوشکی من هێشتا کچێکی پاکە من زۆرم پێدەگووت ژیان ئاوا ناچێتە سەر چۆن ئەم هەموو

قسە ناخۆشانەی ئەوان دەبیستی ودەنگ ناکەی چۆن؟ دەیگووت خودای گەورە ئـارامیم پێدەبەخـشێ . ئەگـەر دەتانـەوێت زیـاتر ڕاسـتیەکان بـزانن زۆر بەڵگەوتاقیگەی دکتۆرم لای خۆم داناوە کاتێك پێش دووساڵ براکەت مرد من بـەنهێنی هـەڵم گـرتن بـێ ئـەوەی خوشکەکەشـم بزانـێ . دیـارە خـوا لـەدڵی نـام هەڵیگرم بۆڕۆژێکی وەك ئەوڕۆ. دیسان بەدشی خوشکەمردوەکەی ووت هیـچت مـاوە تابیلێـت ؟خـوای گـەورە لـەگوناهم خۆشـبێ وەخـوا تـۆ بگـرێ کەبویتـە سـەبەبی ئاشـکراکردنی ئـەم نهێنیـە.داوای لێبـوردنیش لەخوشـکی بـەوەفاو دڵ گەورەم دەکەم.



## (ناحـــەق)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ صدق الله العظيم ﴿البقرة﴾

واتا: {بێگومان ئێمە، ئێوە تاقی دەکەینەوە بەهەندێك ،ترس وبیم وبرسیەتی وکەم بوونی ماڵ وسامان ومردنی کەس وکارو تیاچوونی بەروبوم، وەموژدە بدە بەو کەسانەی کەخۆڕاگرو ئارام گرن.}ت،ئا،

ڕۆژێکیان سەردانی ماڵی ناسیارێکمان کرد، دانیشتبوین لەژوورەوە هەموومان خەریکی چا خواردنەوە بوین لەناکاو دەنگی هاتووهاوار لەکۆڵان هەموومانی بردە دەرەوە تابزانین چیە! کەچوین سەیرمانکرد بینیمان ئەم دەنگە دەنگ وهاوارە تەنهائێمەی نەبردۆتە دەرەوە بەڵکو هەموو هاوسێکان هاتبوونە دەرەوە . لەیەکێك لە ماڵی هاوسێکان بوو. ئافرەتێك هاواری دەکردو دەیووت خوالێتان قبول ناکات. حەقی من هەر دەکات. ئەوەی ئێوە دەییکەن کافریش نایکات ئەی بێ بڕواینە.

ناسیارەکەمان زۆر لای سەیربوو ووتی ئەم ژنە بۆوادەکات چەند ساڵێکە ئێمە هاوسێ و جیرانین هیچ شتێکی وامان لێی نەبینیوە . لەئافرەتەکە چوە پێش و دەستی ڕاکێشاو ووتی با دەنگتان نەیەت عەیبە بەزۆرهێنای بۆژوورەوە .

ئەوکات ئافرەتەکە هەردەگریاو دوعای دەکردمنیش لەناسیاوەکەمانم پرسی چیەتی بۆوادەکات؟

ووتی ئێستا نازانم چیەتی بەلأم ئەوەی من دەیزانم بەر لەئێستایە ئەم ئافرەتە ناوی (ن) پێش شەش یان حەوت ساڵ دەبێ کەشووی کردبەکاك (ش)ئەو هەتابڵێ ی پیاوێکی غەریب بوو فەقیرحاڵ بوو ماڵی باوکی (ش) وەك بڵێی

لەکۆڵ خۆیانی بکەنەوە ئاوابوو بۆیە کە(ن) یان بۆخواست دایك وباوکی نەمابوو لەگەڵ برای و ژن براکەی دەژیا بۆیە ڕازیبوو هەرچەند دەیزانی کەئەو هیچی نیە وحەمباڵی دەکات من ناڵێم کارێکی باش نیە بەڵکوو باس لەژیانی دەکەم وەك خۆی . خانوێکیان لەکۆڵانەکەی ئێمە بەکرێ گرت لەناوی دانیشتن ماڵی باوکی(ش) ڕازینەبوون بەهیچ جۆرێك لەگەڵیان بژین چوونکە وەك دەڵێن(دەست وپێ سپیبوو)بەمانای هیچ کارێکی پێ تەواو نەدەکرا. حاڵ وگوزەرانیان تابلێی خراپ بوو . هەناسەیەکی هەڵکێشاو گووتی خۆی دانیشتووە گوێ لێیە ئەگەر هاوسێکان یارمەتیەکیان نەدابونایە کرێشیان بۆنەدەدرا بەڵام ئافرەتێکی جیران ڕۆژێك بردی بۆماڵی خۆیان ووتی من جل دەدوورم ئەگەر بتوانی یارمەتیم بدەی زۆرباشە (ن)زۆر زیرەکانە فێری کارەکە بوو تا وای لێهات ئامێرێکی دورمانی بۆکڕی گووتی بۆخۆت لەماڵ ئیشی لەسەربکە ئیتر بۆخۆت فێر بووی پێویستت بەمن نەماوە . ئەویش زۆر سوپاس گوزاربوو بۆئەم کارەی کە ئەم ئافرەتە لەگەڵی کرد . جلی بۆخەڵك دەدوری کارەکانی تابڵێی جوان بوو لەلایەن خۆی بەردەوام ئەوانەی کەفێربوو هەمووی فێری (ش)دەکرد بەماوەی ساڵێك دووان هەردووکیان بوون بە باشترین خەیات .

(ش)دوکانێکی دانا لەناو بازاڕ بۆ دووریـنی جل وبەرگی ئافرەتان . خوای گەورە دەرگایەکی بەخێری بۆکردنەوە ماوەی ساڵێك دەبێ ئەم خانوەیان کڕیەوە کەلەناوی دانیشتبوون بەکرێ . لەوماوەیە دووکوڕو کچێکی زۆرجوانیان بوو هەردوکیان هەوڵیان دەدا بۆژیانێکی پڕخۆشی وشادی .ماوەی سێ مانگ بەرلەئێستا (ش)سەیارەیەکی کڕی لەبرادەرێك نیوەی پارەکەی پێدا پێك هاتن نیوەکەی تری بەمانگانە بدات زۆرشادوومان بوون ئێمەش خەڵکی کۆڵانەکە بەهەمان شێوە چونکە زۆر نارحەتی و ئازاریان چەشت .

بەلأم دوای کڕینی سەیارەکەی بەچەند ڕۆژێك توشی کارەساتێکی دڵ تەزێن بوو ! بوەهۆی گیان لەدەست دانی . بەلأم شتێك هەیە کەمن تێناگەم ماڵی خەزوورانی (ن)کەساڵی جارێك نەدەهاتن بۆسەردانیان ئێستا زوو زوو دێن نازانم بۆ ؟ ڕووی لە(ن)کرد گووتی چەند مانگێکە هەر دەڵێم پرسیاری لێدەکەم بەلأم دەڵێم من عیلاقەم چیە باشە ئەم هەرایە چیە ئەوان بۆ دیسان هاتبوون دەتوانی وەلأمم بدەیتەوە؟

(ن) ووتی تۆ باش دەزانی ئەوان نەدەهاتن بۆسەردانمان خەزوورم ئەگەر منداڵەکانمی دیبا لەشوێنێکی تر نەیدەناسین تائێستا یەکێکیان منداڵێکی منیان نەگرتۆتە باوەش وماچیان بکەن پاش مردنی باوکیان زوو زوودێن هەر وەك خۆت گووتت. چەند هەفتەیەك دوای مردنی(ش) گووتیان دەبێ تۆ شوو بەیەکێك لەشوبراکانت بکەیتەوە گووتم خواهەڵناگرێ من لەبەر منداڵەکان ماڵێکی تر تێك بدەم شوبراکانم هەموویان خاوەن خێزانن پاشان کات زۆر زووە باس لەو شتانە بکەین ئەگەر لەبەرمنداڵەکانتانە مام وباوك هیچ فەرقی نیە لەئێستاوە ئێوە هەمووکەسی ئەوانن. ئەوکات ڕۆیشتن .دوای چەند ڕۆژێك دووبارە هاتنەوە هەمان قسەیان کرد. منیش گووتم وازم لێ بێنن من شوو ناکەمەوە هەرخۆشم منداڵەکانم بەخێودەکەم هیچم لەئێوە ناوێت . تادێت موشکیلەکە گەورەتر دەبێت دەزانم ئەو هەرایەی ئەمڕۆش هەر لەبەر ئەوەبوو من دەزانم نەلەبەر منە نەلەبەر منداڵەکانە !

گووتمان چۆن ئەی بۆ وادەکەن؟ گووتی لەبەر خانوەکەیە لەبەر دوکانەکەی بازاڕە. دەزانن هەمووی بەناوی(ش)دەزانن من ڕازی نابم کەشویان پێبکەم باش دەیان ناسم چۆن ئادەمیزادێکن دەگریاو دەیگووت بۆ وازم لێناهێنن . لەوکاتە منداڵێکی بچووکی پێنج ساڵان ڕایکردە ژوورەوەو خۆی بەباوەشی دادا گووتی دایکە وەرە بابچینەوە( ) و( ) هەر وادەگرێن .ئەویش گووتی باپیرەو مامە ڕۆشتن ؟ منداڵەکە ووتی ئا ڕۆشتن. ئەویش دەستی منداڵەکەی گرتوو چۆوە

بۆمـالْ . ئێمـەش گەڕاینـەوە بۆمـالْ تاماوەیـەكی زۆر ئـەم ناسـیاوەم نەبینیـەوە ڕۆژێك بینیم زوو لەهـەوالْی (ن)م پرسـی پێم بلْـی چی لێهات وچیدەكات لەگەلْ مندالْـەكانی ؟ ئـەویش گـووتی ئـەوەی بەسـەر ئـەوهات بەسـەر كـەس نـیْ ئەوئاژاوەیـە نەبڕایـەوە هـەموو ڕۆژێـك شـەڕوهەرابوو هـەتاڕۆژێكیان خـەزوری ڕایكیشا بۆناو كۆلاّنەكە گووتی ئەو خانوەی داگیرت كردوە هی تۆنیە تاكەی تێدەگەیت هی مندالْەكانی كوڕەكەمە تۆش بڕۆ بۆمالْی برات ئەوجێگایەی تۆ مـان لێهێنـاو تۆمـان كـردە ئـەو جـۆرە ژنـە كەشـایەنی هـیچ نـەبووی بـەلاّم خواخێرمان بنووسی كەچەند عەیامێكە ژیانی پاشایان دەژی . هەرچەند ئەو خەلْكە هاتە تكا ورجاو پاڕانەوە فایدەی نەبوو ؟

(ن)لەبەر دەرگای مالْی خۆی كەوتبوو دەگریا دەیگووت هەموی بۆخۆتان بێت تـەنها مندالْـەكانم بدەنـەوە دەڕۆم جـارێكی تـر نامبیننـەوە وەداوای هیـچتان لێناكەم .

دەیان گووت ئێمـەش دونیامـان دیوە دەزانین مندالْـەكانت بدەینیْ هەموو بۆتۆ دەبیْ، بڕۆ لێرە مەوەستە.

گریـانی (ن) لـەكۆلاّن گریـانی مندالْـەكانی لـەمالْ هـەموو خـەلْكی گەڕەكەكـەی هێنابوە گریان

(ن)دەیگـوت مـن هـەر بەلایـەك لێمنـە قـەوماوە بێكەسـم بـیْ دایـك وبـاوك .ئەگەر (ش)خانوەكەی بەناوی من بكردایە ئێستا وام لیْ نەدەهات من ئێستا نـەخاوەن كەسـم نـەخاوەن مـالْم نـەخاوەن منـدالْم ئـەی هـاوار چـۆن وادەبێـت (ئێـستا (ن)لـەمالْی براكەی دەژی . نازانین چی ڕوو دەدات ئایا كەسـی خـاوەن ویـژدان ئـەوەی پـیْ قبـولْ دەكرێـت ؟ ئەگـەر هـەموو خـەلْك نـەتوانیْ شـتێك بكـات ، ئـەوە خودای گەورە قبولْی ناكات هەرچەند كاتیشی بەسەر بڕوات خوا بەسەبرە بـەلاّم بەزەبرە)

# (دڵ رەقـــی)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ صدق الله العظيم ﴿هود﴾ .

**واتـا: {خـۆت بگـرە بەئارام بـە، بێگومـان خـوای گـەورە پاداشـتی چـاكە خـوازان ویارمەتی دەرانی خەڵكی نافەوتێنێ}ت،ئا.**

**بـاجی(.)ژنێكـی زۆردڵ ڕەق وتـووڕە بـوو سـێ كـوڕو ودووكـچی هـەبوو هـەردەم هاتوو هاواری بوو بەسەر منداڵەكانی بەهیچ جۆرێك نـەرموو نیـانی نەدەنواند. نەیدەتوانی خۆی خۆشەویست بكات لەلای هیچ كەس هەتا خاووخێزانی .**

**كـچەكانی گـەورەتربوون لـەكوڕەكان بۆیـە هـەردووكیانی بەشـوو دابـوو. ڕۆژێـك لەگەڵ پیاوەكەی دانیشتبوو گووتی : خـەمێك لـەكوڕەكانت بخـۆ تاكـەی هـەموو كاری ماڵ لەسەرشانم بێیت توانام نـەما!هـیلاك بـوم!ژنیـان بۆبێنـە بـەڵكو هەنـدێ دەحەسـێمەوە؟ ئـەویش گـووتی منـیش پـێم خۆشـە بـەلاًم بـەخۆت دەزانـی كـێ بۆیان دەگونجێ و لەگەڵ تۆش .(باش شارەزای خێزانەكەی خـۆی بـوو دەیزانـی لەگەڵ كەس ئیـدارە ناكـات وەكەسـیش ئـەوەی پـێ قبـوڵ ناكرێـت كەمنداڵـەكانی خۆی قبوڵی دەكەن) ئـەوەی ناسیاوو خـزم بـوو داخـوازی كچەكانیان كـرد بـەلاًم كـەس ڕازی نـەبوو كـچی خـۆی بـدات بـە كـوڕی(بـاجی)بۆیـە داوای بێگانەیـەكیان كرد. خواكردیە قسمەت سەیری كوڕەكەیان كرد پێیان دا،(پرسیارێك؟ئایە لەناو ئێمـەی موسـڵمان چـەند كـەس داخـوازی كـچەكەی هـاتووە پرسـیاری لەنوێـژو ئیمـان وبـاوەڕی كوڕەكـە كردوە،تـەنها پرسـیار دەكـەن دەربـارەی مـاڵی كـاری خـانووی سـەیارەكەی چ جـۆرە،؟ تاكـاتی (مـەلا)مـارەی دەكـات خـواخێری بنوسـی،دەڵێی كـوڕم نوێـژ دەكەی؟،ئـەوكات یـان ڕاسـتی دەڵـێ یـان درۆ دەكات (زانیتان بۆ ئێمە مللەتێكی دواكەتووین، چونكە كاتیەكەمان پێ باشترە)**

ژنیـان بۆكوڕەكـە گواستـەوە . بـاجی بـوو بـەخاوەن بـووكێكی زۆر ژیـرو جـوان . هـەر بـەزویی شـارەزای خەسـوی بـوو چـونكە نـەیتوانی هـیچ گۆرانكاریـەك لـە ڕەوشـتی بـاش بكـات لەهەفتـەی یەكـەم ڕووە تـوڕەو ناڕێـك و ناشـیرینەكەی پـێ نیـشاندا . دەیـووت بۆتـا ئێـستا خـەوتووی؟ بۆقاپـەكان نەشـوراون؟ چێـشتەكە بۆئامادەنەبوە ؟ بۆو بۆی(باجی). كۆتایی نەدەهات .

بووكەكـەی هەرچـەندە تەمـەنی١٧ سـاڵ بووهێـشتا منـاڵ بـوو بـەڵام دڵێكـی زۆر گەورەی هەبوو تووڕە نەدەبوو ئەوەندە كارەی پێی كرابابوایە دەیكرد ئەوەیشی نـەیتوانیبا ئـەنجامی بـدات وازی لێـدەهێنا . هەرچـەند هـاواری بكردایـە گـوێ پێنەدەدا.

زۆرجـار لـەلای كوڕەكـەی دەیگـووت ژنەكـەت بـەگوێم ناكـات واناكـات . ئـەویش دەیزانی دایكی چۆنە دەیگووت : دایكە هێشتا منالە نازانی خەم مەخۆ لەتۆفێر دەبێت تۆش بە سەبریە لەگەلێدا.

لەلای ژنەكەی دەیووت دڵت گەورەبێ بەرامبەر دایكم . خۆی وایـە نـازانی خـۆی خۆشەویست بكات لەوكاتەی بەبیرم دێت ئەو هەروایە؟

ئەویش دەیووت من وادادەنێم دایكمە . كەست دیووە لەدایكی توڕەبێ من گـوێ پێنادەم تۆخەم مەخۆ كەس بەكاری ماڵ هیچی لێ دێت ئەوەی لەلای من گرنگـە تـۆی. پیـاوێكی بـاش ونـەرمونیانی وەك دایكـت نیـی. تـۆ كـرداری ڕەفتـارت بـەباوكت دەچـیت ئـەویش زۆر دڵ گەورەیـە زۆر بەبەزەییـە ئەگـەر وەك دایكـت بوایە قەت بەیەكەوە نەدەگونجان هەردوكیان .

بـەڵام ئەوخۆشـیە بۆبـاجی تاسـەر نـەبوو كەچوارسـاڵ بـوو بوكەكـەی لـێ قبـوڵ دەكـرد جوێنـوو قـسە ناشـیرینەكانی . دوای ئـەوەی كوڕەكـەی تـری ژنـی هێنـا بووەخاوەن دوو بووك.مـانگێكی پـێ نەچوو بـووكی بچوكی چۆوە مـاڵی بـاوكی بەزیزبوون . پاش چەند ڕۆژێك خزمـوو جیران چوون هێنایانـەوە . هـەر فایـدەی نـەبوو هـەموو ڕۆژێـك هـەرایان بـوو دەنگیـان بـەرز دەبۆوە . تـا دوای سـێ مـانگ

گواستنەوەی پەتی تەحەمولی بووکە بچوکەکە پچڕا ئاگری لەخۆی بەردا و زۆربەخراپی سووتا دوو ڕۆژمایەوە لە نەخۆشخانەو پاشان مرد . کوڕی باجی(گیرا)چونکە ماڵی خەزوری تاوان باریان کرد بەکوشتنی کچەکەیان . دوای تکا کردن وهاتوو چونێکی زۆر ڕێك کەوتن لەگەڵیان کەپارەیەکی زۆریان بدەنی لە جیاتی خوێنی کچەکە . هەرچی هەیان بوو فرۆشتیان و زۆریشیان قەرد کرد تا بتوانن پارەکە بدەن وکوڕەکە دەرکەن لەبەندینخانە .
بەیانی ئەوڕۆژەیە کەڕێك کەوتن لەسەری کەپارەکەیان پێبدەن . شەو درەنگ بو هاواری کرد بەسەر بووکە گەورەکەیداو ووتی : بەیانی زووهەستە تەندورەکە پێکەو نان ئامادەبکە دەبێ زوو بڕۆین کاری گرینگمان هەیە. هەمویان خەویان لێکەوتبوو، کاتێك چرپەیەك لەحەوشەکە هات باجی زۆر ترسا : ووتی دزنەبێت بۆپارەکەهاتبێ ! لەپەنجەرەکە سەیرێکی دەرەوەی کرد هیچی نەبینی دڵی خەتەرەی کرد ووتی باشتروایە لەشوێنێکی باش ئەم پارە هەڵگرم . چەند جێگای پێکرد هەردوودڵ بووتادوایی بیری لەناوتەنورەکە کردەوە . بەپەلە پارەکەی هەڵگرتوو خستیە ناو تەنوورەکە، بەهەندێ چیلکە دار وپووش سەر داپۆشی گووتی ئێرە باشترین شوێنە کەس نای دۆزێتەوەو بیریشی بۆناچێ.
چۆوە سەر جێگاکەو خەوێکی قوڵی لێکەوت . بەیانی زوو بوکەکەی هەستا لەخەو هەویرەکەی هەڵگرت و چووبۆ لای تەنورەکە سەیری کرد دارو چیلکەی تێدایە و
ووتی زۆر سەیرە چۆن خەسوم تەنورەکەی وابۆم ئامادە کردوە. قەت شتی وای نەکردووە کەمێك نەوتی پێداکردو ئاگری تێبەرداو. تا دەچم نوێژ دەکەم بۆخۆی جوان دادەگیرسێت .
بۆنەخۆشەکەی نانی تەنوور باجی بەخەبەر هێنا بەڵام تازە هیچ نەما زۆردرەنگ خەبەری بۆوە پارەکە هەمووی بوو بەخۆڵەمێش ،کەوای دی کەوتەسەر زەوی و ئاگای لە دونیا نەما . ئەم کارەساتە وای کرد لاڵ بێ لەزمان

بکەوێت پاش ئەوەی باجی لەم کارەساتە زمانی لەدەست دا وهەمووکات سەیری بووکە گەورەکەی دەکردوو دەگریابیری لێدەکردەوە چی لێدەکرد چۆن ئازاری دەدا، تەنها بۆجارێکیش ئەو وەلامی نەدەدایەوە وقسەی ڕەق و نابەجێی نەکرد ،هەرچەند دەیتوانی وەلامی بداتەوە بەلام دڵ گەورە بوو بەچاوی دایك تەماشای دەکردوقسەکانی کەپێی دەگوت قبوڵی دەکرد، وەچی لەپیاوەکەی و منداڵەکانی دەکرد . کەهیچ کات قسەی شیرینی بەدەمدا نەدەهات(( بۆیە ئەم زمانە ئەگەر بۆ وەستان نەبێت بەکەڵك هیچی تر نایێ)).

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَا ۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾ صدق الله العظيم ﴿الحج﴾

واتا: {ئایا ئەوانەبەسەر زەویدا نەڕۆیشتوون وە بەدڵ ودەرونێکی هۆشیارەوە بیریان نەکردۆتەوە ولێکیان نەداوەتەوە..(کوان خەڵکانی ڕابردوو؟ ئەوشارانە بۆ کاولکران؟ کێ ئێمەی دروستکردووە؟ ئامانج لەژیان چیە؟)یاخارەنی گوێ ودەزگای بیستن نەبوون،کەگوێ بۆڕاستی بگرن ولێکی بدەنەوە، جا وەنەبێ دەزگای بینایی کوێر بووبێت، بەڵکو ئەو دلانە گوێردەبن کەوا لەسینەکاندان(چونکە هەر ڕواڵەت دەبینن و ناوەڕۆك لێك نادەنەوە.}ت.ئا،



# (کەم تەرخەمی)

بەیانیەك زووکاك(م) بۆسەرکار دەچوو لەماڵ ،چووە دەر دوای کەمێك گەڕایەوە بەخێزانەکەی (ش)ی گووت ئەمڕۆ زۆر دڵم توندە خەونێکی ناخۆشم بینی ئەم شەو! ئاگادرای منداڵەکان بە نەچنەکۆڵان . نەچنەسەربان . بەڕێ کەوت لەلای دەرگا دیسان دووبارەی کردەوە قسەکانی. (ش)سەری خۆی باداو ووتی تۆئەمڕۆ چیت بەسەر هاتووە بڕۆ!

٣منداڵیان هەبوو(شەوبۆ\٦ساڵان،شەیدا\٤ساڵان،شەماڵ\١ساڵ بوو) (م) هەرگەیشتە شوێنی کارکردنی تەلەفۆنی کرد بۆماڵەوە ووتی : ئەمڕۆ ئیزن بخوازم بگەڕێمەوە نازانم بۆئەوەندە دڵتەنگم منداڵەکان چۆنن تۆ خەریکی چی؟ (ش)ووتی ئیزن مەخوازە هیچ نیە تەنها وەسوەسەی شەیتانە بەنەفرەتیکە بۆوا لەخۆت دەکەی منالەکان وایاری دەکەن منیش خەریکی کاری ماڵم هیچ دوودڵ مەبە لەسەر کاری خۆت بەردەوام بە .

دوای ماوەیەك دیسان زەنگی تەلەفۆن لێیدا .

(ش)لەدڵی ووتی،دووبارە(م)تەلەفۆنی کردەوە ئەمڕۆ نازانم چی بەسەرهاتووە ؟ بەڵام ئەونەبوو خوشکی خۆی بوو،

خوشکەکەی: چۆنی چیدەکەی ؟

(ش)باشم بەڵێ لەماڵم دیارە دێیت بۆسەردانم!

خوشکەکەی: من ناتوانم بێم دایکم لێرەیە . گووتم بەڵکو تۆ بێیت،

(ش)دایکم لەگەڵ کێ هاتووە ؟ ناتوانێت کەمێك بێتە لام ؟ من خەریکم چێشت ئامادە دەکەم بۆنیوەڕۆ . خۆت دەزانی (م) زوو دەگەڕێتەوە لەدەوام .

خوشکەکەی: چۆن دایکم دەگاتە ماڵی ئێوە باش دەزانی لەبەر ئازاری قاچی ناتوانێ بڕوات . برامان(.)هێنای دوای نیوەڕۆ دێیت بەدوایدا دەیباتەوە. تۆ وەرە کارەکانت تەواو بکەو کەمێك وەرە . ماڵتان ئەوەندە دوورنیە یەك کۆڵانمان بەینە باشە ؟

(ش)سەلام لەدایکم بکە نەوەك نەیبینم نەتوانم بێم . هەوڵ دەدەم ئەگەر ڕێکەوت بێیم، خوات لەگەڵ.

دڵی کەوتە تەتەرە بچم نەچم چیبکەم. بەزوویی کارەکانی تەواو کرد سەیری کرد سعات١١ی نیوەڕۆیە . لەدڵی ووتی کات ماویەتی بۆنیوەڕۆ بۆماوەیەکی کەم دەچم بۆماڵی خوشکەکەم ودایکیشم دەبینم . قسەو ئامۆژگاری و دڵە ڕاوکیی (م)ی لەبیر کرد بیٚ ئەوەی تەلەفۆنیکی بۆ بکات وئاگاداری بکاتەوە بڕیاری خۆی دا. بەشەوبۆ وشەیدای گووت براکەتان خەوتوە لەناوبێشکە دەنگەدەنگ وهەرا نەکەن لەژوورەوە بۆخۆتان یاری بکەن بە( میکانۆو بوکەڵەکانتان)دەرگاکان هەمووی دادەخەم تانەچنە دەرەوە . زۆرم پێ ناچێت دەچم بۆماڵی پورتان زوو دەگەڕێمەوە پێش ئەوەی باوکتان بگەڕێتەوە؟!

دەرگاکانی هەمووداخست . تا دەرگای بەیتونەو هۆڵیش . نەوەك لەسەربان بکەون یان لەبەر دەرگا سەیارە لێیان بدات. ئەوکات دەرگای دەرەوەشی لەدوای خۆی قایم کرد ڕۆیشت.!

منداڵەکان بۆخۆیان یاری دەکەن بەڵام بێزار دەبن . لەچێشیخانەکە چەرخ دەدۆزنەوە هەندێ لایلۆن دێنن بۆیاری کردن ئاگری پێدەکەنەوە . بەڵام یاری ئاگری زیاد دەکات وجێگاکان وردە وردە ئاگر دەیان گرێتەوە ئەم منداڵە بچوکانە سەریان لێدەشێوێ نازانن چیبکەن هاوار دەکەن کەس گوێی لێان نیە (شەوبۆ وشەیدا) ڕادەکەن بۆحەمامەکە دەرگاکە قایم دەکەن لەسەر خۆیان . وایان زانی لەحەمامەکە هیچیان بەسەر نایەت .

دراوسێ ڕخەڵکەکە بۆنی ئاگرو دوکەڵ دەکەن ئەودەڵی ئەم بۆنەچیە ئەویتر هەروا چاویان دەگێڕا . دوکەڵیان بینی لەماڵی کاك(م) بڵند دەبێت لەدەرگایان دا هیچ دەنگ نەبوو پەیوەندیان کرد بەئاگر کوژێنەوە . خەڵکەکە دەرگایان پاڵدەنا بیکەنەوە لەوکات (م) هاتەوە ئەوەچیە ئەوئاگرە لەماڵەکەی منە؟ منداڵەکانم خێزانەکەم؟ دەرگایان شکاند چونە حەوشەکە (م)هەرهاواری

دەکردوبانگی دەکردن بەلاّم هیچ وەلاّم دانەوەیەك نەبوو.لەبەر گڕە بەتینەکەی ئاگرەکە کەس نەیدەتوانی نزیك بێتەوە.

(ش)گەیشتە سەری کۆلاّنەکە کاتێك سەیارەی ئاگر کوژێنەوەکەش دەسوڕایەوە بۆکۆلاّنەکە ووتی ئەمبۆکویّ دەچێت؟ لەخەڵکەکەی دەپرسی کەهەمووڵەماڵ هاتبوونە دەر سەیری ماڵی ئەوانیان دەکرد بەڕاکردن ڕۆیشت تاگەیشتەماڵ چی بینی ماڵەکەی ئەوانە ئاگری گرتووە. (م)کەئەوی بینی ووتی الحمدلله ئێوە لەماڵ نەبوون .ئەویش نەیتوانی هیچ بڵێ دەگریاو هاواری دەکرد(م)ووتی مەگرییّ بۆماڵی دونیا،ئێوە سەلامەتبن هیچ گرنگ نیە. یەکێك لەئاگر کوژێنەوەکان هاتەدەرەوە وهەندیّ وردەداری سوتای بەدەستەوە بوو گووتی ؟ ئایا هەر ئەومنداڵەی ناوبێشکە لێرەبوو ؟ م.ڕوی لە خێزانەکەی کردوو گووتی تۆ شەماڵت لەماڵ جێهێشتبوو قسەبکە بۆدەنگ ناکەی ؟ ئەویش بەدەم گریانەوە هاواری کردوو بەهەردوو دەستی لەسەری خۆی دەدا تەنها شەماڵ نا بەڵکوو ئەوانی تریش لەژوورن .

(م) ڕایکردە ژوورەوە بەشپڕزەیی هەمووی گەڕا. ڕایکرد بۆسەربان بەلاّم هیچی نەدۆزیەوە بێتاقەت بوو کەوتەسەر زەوی ودەگریا لەکێن بۆدیارنین؟ بانگیان کرد وەرە ئەوان لێرەن دەرگایان داخستووە لەحەمامەکە. کەدەرگایان کردەوە چیان بینی شەوبۆ وشەیدا دەستیان لەملی یەك کردووە وبەقایم یەکتریان گرتووە نەسوتاون !بەلاّم بەداخەوە خنکاون لەبەر دووکەڵەکە (م)کەئەوانی بەم شێوە بینی وەك شێتی لێهات ڕایکردە لای(ش)ئەی من نەمگووت ئاگاداربە ئەمڕۆ هەست بەدڵ توندی دەکەم تۆ چۆن جێت هێشتن بۆ واتکرد بژماڵی منت کاولکرد .

ئەویش هەر دەیگووت منیش نازانم چۆن ئەوە ڕویدا.

زۆری لێدا هەرچەند دەیانگرت بەلاَم ئەوهەر پەلاماری دەدا لەم راكیش راكێشو ئەوهەرایە (م)پاڵێكی نا بەخێزانەكەی ئەویش سەری خراپ بەزەوی كەوت .
تابردیان بۆ نەخۆشخانە گیانی لەدەستدا،
لەیەك تێنەگەیشتنێك وكەم تەرخەمیەك بوە هۆی لەناوچوونی خێزانێك.
ئێستا(م)لەبەندیخانە ژیان دەباتە سەر بەهۆی كوشتنی خێزانەكەی كەبەبێ ویستی خۆی بوو .
دەڵێ ماڵم منداڵم خێزانم هەمووی بەچاوتروكانێ لەناوچوو . شەوكەدەخەوم دەڵێم بەیانی هەڵدەستم لەم خەوەناخۆشە بەلاَم خەون نیە(ئاخ خۆزگە خەون بوایە) ﴿ بسم اللەالرحمن الرحیم ﴾وَلَن يُؤَخِّرَ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِذَا جَآءَ أَجَلُهَاۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١١﴾ صدق اللە العظیم ﴿المنافقون﴾ واتا {(ئەو داخوازیە بەجێ نیە،چونكە)ڕۆژی هەركەسێك تەواو بوو، كاتی مەرگی هەركەسێك هات ،هەرگیز خوا دوای ناخات ومۆڵەتی بۆتازە ناكاتەوە، خوایش زۆرئاگادارە بەهەموو ئەوكارو كردەوانەی كە ئەنجامی دەدەن و(هەرگیز لێی وون نابێت،}ت. ئا.



## چۆن ؟وەلەچ کاتی؟ دۆست دەبێ بەدوژمن!

کاك(م)پێش حەوت ساڵ چوو بۆ هەندەران وەك خەڵکی کوردستان وگەنجەکانی کەماوەیەك بوو هەموو دەچوون بۆدەرەوەی وولات ببوو بە چاولێکەری! ئەولەڕقی ئەو ، ئەویش لەحەسودی ئەویتر، بەهەرحاڵ ئێمە باسی بنەماڵەیەك دەکەین لەبەر ماڵی دونیا دوومندال! کەکوڕێك وکچێك ودایکیانی بەجێهێشت بوو ڕویی لەدەرەوە کردبوو. بەخێزانەکەی گووتبوو هەرکە جێگیربووم ڕاتان دەکێشم بۆلای خۆم. دیارە کاتەکەی هات و بە(د)هاوسەری گووت خانووەکە بفرۆشە وخۆتان ئامادەبکەن لەوماوەیە یەکێك دەنێرم بەدواتان.

(د)پەیوەندی بەماڵی خەزورانی کرد ئەگەر پارمەتی بدەن خانووەکەی بۆ بفرۆشن ؟ ئەوان زۆر بەبێ بەزەییانە وەلامیان دایەوە ئێمە غولامی تۆنین کارت بۆجێبەجێ بکەین کەیفی خۆتە چۆن دەیفرۆشی بیفرۆشە. (د)گووتی ئێوە لەسەرەتاوە پشتتان لەئێمە کرد لەو ڕۆژەی کە(م)ڕۆیشت ئێستا چاوەڕوانی چی لەئێوە بکەم . ناچار چوو بۆماڵی باوکی داوای کرد خانووەکەی بۆبفرۆشن بەزوترین کات . دوای دووڕۆژ باوکی لەگەڵ براکەی کڕیارێکیان هێنا (د)ووتی من خانووەکە بەهەموو کەلوپەلەکانیەوە دەفرۆشم تەنها جلوبەرگی خۆمان دەبەین. کڕیارەکە سعرێکی پێدا(د)ووتی هەرچەند زۆر لە حەقی خۆی کەمترە بەلاّم ناچارم ڕازیبم، نیوەی پارەکەی وەرگرت ونیوەکەی تری مایەوە تا بەناوی دەکات. پاش هەفتەیەك خانوەکەی بەناوی خاوەنەکەی کرد. باوکی منداڵەکان پەیوەندی کرد کەدوای چوار ڕۆژی تر وەرن بۆفلاّن شوێن لەوێ کەسێك چاوەڕێتان دەکات ودەتانگەیەنێ بەلای من، باوك وبراکەی (د)لەگەڵ خاوەن خانوەکەهاتن بۆئەوەی پارەکەی کەماوە پێی بدەن. ئەویش بەباوکی ووت : دووای چەند ڕۆژێکی تر دەڕۆم نازانم تاچەندی تر نایەمەوە ویەکتر نابینین. بۆیە داوات لێدەکەم دایکم وخوشکم بێنیی بۆلام چەند ڕۆژێك؟ باوکی گووتی ئەمڕۆهەندەیَ کارم هەیە بەیانی دەیانهێنم بۆلات . دوایی ڕووی لەبراکەی کرد گووتی وەرە لەگەڵم . بردی بۆسەر جانتا پارەکە هەندێکی لێ دەرکرد نزیکەی (٣٠)وەرەقەیەك دەبوو گووتی بیگرە بۆخۆت ماڵەکەتی پێ ئاوەدان بکەوە ژنێك بێنە کەی پارەی تریشت ویست تەلەفۆنم بۆبکە بۆتی ڕەوان دەکەمەوە خەمی

هـیچ شـتێکت نـەبێ .ئـەویش گـووتی زۆرعەیبـە خوشـکم ئاوادەکـەی واتـا مـن یارمـەتی بـاوکم دا تاخانوەکەت بفرۆشین حەقەکەم دەوێت جارێکی تـر قسەی وابکـەی لێـت حـادز دەبم . هەرچـەند هـەوڵی دا (د)لەگـەڵی بـەلاَم ئەوهـەر قبـوڵی نەکرد. خواحافیزیان کرد و ڕۆیشتن.

شەو درەنگ بوو کاتێك چرپەیەك هات (د)سەیری حەوشی کرد بینی. دووکەس لەسەر دیواری حەوشن خەریکن دێنەخوار ، ئەویش بەزوویی تەلەفونی کرد بۆ پـۆلیس، دوای چـوو دەمانـچەکەی هێنـا کەئـەوکات پیاوەکـەی ڕۆیـشت بـۆی کڕیبوو تاپاسەوانی خۆی پێبکات بەلاَم کەس نەیدەزانی. دزەکان گەیشتنە لای دەرگـای ژوور هــەوڵیان دەدا دەرگاکــە بکەنــەوە(د)زۆرترســا هــاواری کــرد بگەڕێنەوە نەوەك دەتان کووژم ، دووبارەی کردەوە بەلاَم ئەوان گوێیان پێنـەدا ، گولەیـەکی تێگرتن یـەکێکیان کەوتەسـەر زەوی . ئـەوەی تریـان شڵەژاو ویـستی ڕابکـات لـەناکاو پـۆلیس دەوری ماڵیـان گـرت نـەیتوانی ڕابکـات. پۆلیـسەکان دەسبەسەریان کرد چوون بۆلای ئەوی تر کەگولەکەی بەقاچی کەوتبوو بانگی (د)کرد وەرە دەرەوە بزانە ئەم دووکەسە دەناسی ئەویش هاتەنزیك سەیری کرد ئەوەی بریندارى کردوە براکـەیتی ئـەویتریش مـامی.لـەجێگای خـۆی دانیشت و دەسـتی کردەگریـان ویەخـەی براکـەی گـرت ، کەسـیش نـاتۆ بـرام هـاتووی دزی لەخوشکت بکەی بۆچی واتکرد پێـت گوتبـام چەندت پێویـستە پێتم دەدا بـەلاَم وات نـەکردبا .مـن چیبکەم ئێـستا چۆن وەلاَمـی خـەڵك بدەمـەوە چۆن وەلاَمـی (م)بدەمەوە لەگەڵ ماڵی باوکی بۆڕوو ڕەشت کردم ،

ڕاستە ئەوەی ڕویدا زۆر سەیر بوو بڕواکردنیشی سەختە بەلاَم ئـەوە ڕاسـتیەکە بـوو .هـیچ کـات قـسەی پێـشینان هـەروا بـەخۆڕایی نـەوتراوە . کـە دەڵێن پـارە دۆست دەکا بەدوژمن . دوژمنیش دەکابەدۆست.



(بابەتی حەوتەم)

## (ڕازیبوون بە دانانی خودا)

(ارض بما قسمه الله )

**کارو کردەوەی خودای گەورە هەمووی ڕێکە وەبۆ بەرژەوەندی ئادەمیزادە .**
**بەڵام ئادەمیزاد بەهیچ جۆرێك ڕازیی نیە بەوبەشەی کەبۆیی دیاری کراوە:**

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ﴿٤﴾ صدق الله العظیم ﴿النحل﴾

**واتـا: {ئادەمیزادیـشی لـە نوتفـە بـەدیهێناوە،(کەچـی دوای ماوەیـەك کـەخۆی بینیوەتەوە)کوتوپڕ بووە بەدوژمنێکی ئاشکرا}ت.ئا،**
**ئەگەر ئادەمیزاد ڕازیی بوو بەئەوەی هەیەتی وخوای گەورە بەقسمەتی کردوە {لـەماڵ_لەمنـداڵ_لەتەندروسـتی_هتـد.}وەتـاکو{جوانیـت لـە، لـەش ولارت لـەدەموو چـاوت لەبـەژن و بـاڵات.هتـد.}بڕوابکـە تۆباشـترین کـەس وجـوانترین کەسی بەڵام تۆ هەست بەخۆت ناکەیت لەبەر کەم قەناعەتیت ،زۆرجـار جوانی وڕێك وپێکی مرۆڤ لەڕەوشت و کرداریتی ئەوەی بەرامبەرەکەی دەیبینی خۆی نایبینی،هەروەها بەپێچەوانەوەش زۆر جار ڕەوشتی ناڕێکی ناشیرینی دەکات هەرچەند دەوڵەمەند وجوان وڕێك بێت (ظاهیری)واتا لەدەرەوە بەڵام چواردەوری خۆشیان ناوێت ئەویش هەستی پێناکات، چونکە(باطني)باش وجوان نیە،بۆیە دەڵێم هـەردەم سـەیری لـەخۆت بـەرەو ژوورتـر بکـە ، سـەیری لـەخۆت بڵنـدترو گـەورەتر مەکـە، ئـەوکات هەسـت دەکـەی چ نیعمەتێکـە تـۆ تێایـدای، ڕازینـەبوونێکی تـر بـاس بکـەین کـەزۆرن وە دەمـەوێ هەنـدێکیان بخەمـە ڕوو؟بۆچـی زۆر هـەن کـەوا کـوڕ زاڵ دەکـات بەسـەر کـچ ئەگەرچـی کـچەکەی بەتەمـەن گـەورەتریش بێـت لەکوڕەکـەی . خۆشـی دونیـا و باشـی وهـەبوونی**

بەهەموو جۆرەکانی بۆکورەکەی دەویت . هەردەم پاڵپشتی ئەودەکات وخەم بۆداهاتووی هەڵدەگرێت . تائیستاش لەلای هەندێ خەڵکی نەزان کچان بێبەشن لەفێربوون وچونە قوتابخانە . دەڵێن کچ هیچ مافێکی نیە.تائێستاش لەزۆرشوێن ئافرەت بەشوونادەن لەبەر خزمەتکردنی ماڵ وماڵات.تائەوکاتەی ماوەی شوکردنی بەسەردەچێت. ئەگەر لەگەڵ ئەم جۆرە باوك ودایکانە دەدوێ ی خۆیان پێ زاناترین کەسە .تەنها ئەوەندە بەسە بۆکەسی تێنەگەیشتوو (خودای گەورە مافوو رێزی داوەتە ئافرەت سورەتێکی بەناوی ئافرەت دابەزاندوە) بزانن ئافرەت؟دایکە.خێزانە.خوشکە.کچە.پوورە..هتد _ئافرەت نیوەی کۆمەڵە.من لەگەڵ ئەوەدانیم کەواسەربەخۆیی تەواو بەئافرەت بدرێت .چونکە جیاوازی زۆرهەیە لەبەینی پەنجەکانی ئادەمیزاد نەوەك ڕەوشت وهەڵوێستی مرۆڤەکان .بەلاّم ئەویش خاوەن بیروبۆ چوونە. زۆرجار ڕای ئەو و بۆچوونی ئەوباشترە لەهەموو ئەوانەی لەماڵن پەیوەندی بەبیر کردنەوەوبۆچوون هەیە نەوەك بەڕەگەز. شتێکی تریش هەیە گرنگە!من خەڵکانێك دەناسم لۆمەی کوڕەکانیان دەکەن وپێیان دەڵێن ؟ بەڕاستی ئێوە هیچ نازانن! سەیری مێردی خوشکەکەتان کردوە چی دەکات : ئەوەندە زیرەك و ئازایە پارە لەژێر زەوی دەردەکات چاوکراوەیە وایە..وایە.. وادەزانی کچەکەی بێگانەیە واباسی ئەو دەکات کەئەنەما ماڵی منداڵەکانی ئەوی زەوت کردوە، وادەزانی هیچی ترئەم کچە منداڵی ئەونیە وهیچی ئەونیە بوو بەبێگانە وەخێرو خۆشی ئەو هیچ گرنگ نیە چونکە لەماڵێکی ترە،هەرچەند کوڕەکەی ژنێکی بێگانە بخوازێ هەر کوڕی ئەوە.!

هەروەها هەن ئەوانەی موژدەی کچیان پێدەدرێت وادەزانن هەواڵی مەرگیان پێدراوە زێربەداخم بۆئەوانە (الله یعلم وانتم لاتعلمون)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

أَمْوَٰلُكُمْ وَلَآ أَوْلَٰدُكُم بِٱلَّتِى تُقَرِّبُكُمْ عِندَنَا زُلْفَىٰٓ إِلَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ جَزَآءُ ٱلضِّعْفِ بِمَا عَمِلُوا۟ وَهُمْ فِى ٱلْغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ صدق الله العظيم {سبا}

واتا {(لەڕاستیدا)ئەماڵتان نە نەوەتان شتێك نین کەببنە هۆی نزیکبوونەوەتان لەئێمە،(یا رازیبوونی ئێمە لێتان)بەڵکو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کاروکردەوەی چاکە ئەنجام دەدەن(ئەوانەنزیکن لەئیمەوەو ڕێزیان لای ئێمە هەیە)ئائەوانە پاداشتیان چەند بەرامبەرە بەهۆی کردەوەی چاکیانەوە، هەرئەوانەش لەکۆشك و تەلارەکانی(بەهەشت)بەئاسودەیی وئارامی وخۆشی ، ژیان دەبەنە سەر} ت.ئا.

ڕازیبن بەدانان و ئەوبەشەی خودابۆی داناون، بەهەبونی منداڵ وهەبونی سامان ولەش ساغی وکوڕوکچ هتد،بەنەبوونیش هەروەها لەماڵ ومنداڵ وتەندروستی هتد.

بەداخم بۆهەندێ کەس نەوەك تەنها بەینی کوڕو کچ بەڵکو بەینی کچەکانی دەکات یا بەینی کوڕەکانی ! _باسی دایکێکتان بۆ دەکەم کەوا دایك نمونەی وەفاداری ودڵ گەورەییە . ئەگەر ووتمان دایك یان باوك مانای وانیە ئەوان بەتەمەنن وەدونیا دیتەن هیچ هەڵە ناکەن .هەموو کەس هەڵە دەکات بەڵام ئەوەی هەڵەبکات وپەشیمان بێتەوە باشترە لەوەی کە پەشیمان نابێتەوە. جارێك دایکێك دەچێت بۆسەردانی کوڕەکەی . کەخێزاندارە خانویێکی بەکرێ گرتووە،ئەم دایکە کەبەبێ خەبەرێك سەردانیان دەکات کاتەکەش نزیك نیوەڕۆیە دەبینێ (بووکەکەی)ژنی کوڕەکەی (ساوارە سورەی)لێناوە خەریکە زەلاتە دەکات. کاتێ کوڕەکەی دەگەڕێتەوە پێی دەڵی کوڕم بۆخۆت لەبازاڕ

نانێکی باش بخۆ تۆماندووی بەوجۆرە خواردنانە تاقەتت نابێ، کوڕەکەی دەڵێ دایە من چۆن دەتوانم لەدەرەوە خواردن بخۆم ئەی ئەم دوو منالەم ئەی دایکیان کـردی بەپێکـەنین گـووتی بەحیـساب ئـەوان دووکەسـن (حـەملی هـەبوو ژنەکەی)پاشان ئێمە کرێچین تۆباش دەزانی کارەکەم وانیە کەبتوانین ڕۆژانە خـواردنی دەوڵەمەنـدان بخـۆین بـەلام لەخوابـەزیادبێ ئێمـە لـەزۆر خێزانـی تـر باشترین، دایکەکە لەکاتی ڕۆیشتن ووتـی ڕۆژی هەینی وەرە بۆماڵمان بەینێکە نەهاتووی براکانت بیرت دەکەن ، ئەویش ووتی تەنها من بێم یان هەموومان ئەگـەر ئـەوان نـەهێنم نایـەم؟ ئـەویش ووتـی هـەمووتان وەرن، بەخێزانەکـەی دەگوت وادیارە دڵی بەحاڵمان سوتا بۆیە حەزی کرد هەینیی بچین بۆ ئەوێ براکانم حاڵیان لەئێمە باشترە .خواردنێکی خۆش ئامادە دەکەن ، ڕۆژی هەینی چوون بۆ ئەوێ ! بەلام کاتێ کە سفرە ڕاخرا چیان بۆدانان ئەگەر برِوادەکەن (نیـسك)کوڕەکـەی لـەدڵی خۆیـداووتی دایکـم وادەزانـی درۆی لەگەڵدادەکـەم کەدەڵێم نیمە.بەساوارەکە ڕازی نەبوو کەچیی ئەمڕۆ نیسکی داناوە بۆمان ، براکانی کاتێ ئەوەیان بینی ووتیان ئەوە چیە بۆ خواردنێکی خۆشتان ئامادە نەکردوە؟ دایکیـان گـووتی ئێمـە کرێـچین خـواردنی باش وخـۆش پـارەی زۆری دەوێ بـۆ ئەمـە هـیچ عـەیبێکی هەیـە؟ کـات بـەرەو عەسـر بـوو کوڕەکـەی بـە منداڵـەکانی گـووت خۆتـان ئامـادە بکـەن کـەمێکی تـر دەڕۆیـن. دایکەکـە بـانگی کچەکەی کرد پێی ووت برۆ لەسەلاجەکە گۆشتێکی جوانی تێدایە ببخەرە سـەر ئـاگر هەنـدێ بـرنجیش بـشۆرەوە تەماتـەو بامیـەشمان هەیـە بیکـە بەمەرەگـە ، کوڕەکە ووتی دایە ئێمە دەڕۆین پێویست ناکا خۆتان ماندوو کەن ،خۆشیەکی ئێوەمان دەوێ بۆ خـواردن نـەهاتووین. ئەویش گووتی دەزانم لێرە نابن ئەمەم بۆئێـوە نیـە بـۆ(براژنەکەتـە)حـەملی هەیـە پاشـان ئـەو زۆر حـەزی بەگۆشـتە لێراهـاتوە چـاکە ئێـوە لێرانـەهاتوون ئەگـەر بیخـۆن خراپـە بۆتـان لـەدوێنێوە بەسـەردان چـۆتەوە مـاڵی بـاوکی پـاش کـەمێکی تـر براکـەت دەیهێنێتـەوە .!

ئەڵێم؟پرسیارێك لەئێوە بکەم ؟ بۆچی ئەم ئافرەتە وای کرد؟ باشە ئەگەر ئەم خواردنەی بۆئەوان ئامادە کردبوایە باشترنەبوو؟ باشە هەردوو بووکوکەی حەملیان نەبوو؟ بۆچی یەکێکیانی لەئەویتریانی زیاتربەرزکردەوە؟ دەیزانی ئەوان خۆیان ئامادە دەکرد بۆڕۆیشتن نەیدەتوانی باس نەکات تائەوان دەڕۆیشتن؟ کوڕەکەی تاوانی هەیە کەنەبونە؟ ئەگەرکوڕەکە ڕازی نەبێ بەکرداری دایکی چیبکات باشە؟ ئەگەردایکێك وا جیاوازی بنێتە بەینی کوڕەکان یان بە ڕۆنتر بەینی بووکەکانی چی بکەن باشە؟ چۆن هەڵسوکەوت بکەن لەگەڵی چ پلەوپایەیەکی دەبێت لەدڵیان ئەم ئافرەتە؟ئەم دایکە ؟ ئەم خەسووە؟



# (ڕێگرو باڵندە)

ڕازی بوون بەهەموو دانان و کارێکی خودا ئارامی بەدڵ وهەستی مرۆڤ دەبەخشێ ڕازیبوون بەهەبوونی بەنەبوونی بەنەخۆشی بەئازارەکان وکارەساتەکان ونەهامەتیەکانی ژیان.

(القناعە کنز لایفنی)ڕازیبوون گەوهەرێکی بێ کۆتاییە.

لەسەردەمێکی زۆر پێش ئێستا ڕێگرێك هەبوو، هەر کاروانێك وڕێبوارێك بەم ڕێگایە ڕەت بوایە کەئەوی لێبوو پەلاماری دەدان وشتووەکی زۆری لێدەستاندن بەزەبری شمشێروترساندن. زۆرلێی دەپاڕانەوە ئەوکارە نەکا پارەو ماڵیان زەوت نەکات بەڵام فایدەی نەبوو.کاروانێ لەوێوە ڕەت بوو ئەویش زۆر خواردن وشتی گێڕایەوە لێیان دەیگووت ئەگەر وانەکەم لەبرسان دەمرم لەسەرمای زستان ڕەق دەبمەوە چوو پاڵی دایەوە ماڵ و دارایەکی زۆری کۆکردەوە بەماوەیەکی کەم وماندووبونێکی کەم ووتی: تاماوەیەکی باش بێخەم دەبم خوادای هەرپاڵکەوە(خوای گەورە دەدات ڕاستە بەڵام بەکاروکردەوەی جوان نەوەك بەڕێگری وتالان کردن ودەست بەسەر داگرتن). لەگەڵ خواردنەکانی کە گێڕابویەوە خورمای تێدابوو لەناکاوسەیری کرد باڵندەیەك هات و لەدەوری شتوومەکەکە دەسوڕایەوە دوای دەنکە خورمایەکی بەدەنووك هەڵگرت ڕهەڵفڕی وڕۆیشت. پاش کەمێك دووبارە هاتەوە دەنکەخورمایەکی تری هەڵگرت و فڕی پیاوەکە.ووتی دیارە تۆش زۆرت برسیە بەدەنکێك تێر نەبووی دەنکێکی تریشت برد. بەڵام ئەمجارەش دووبارەو سێ بارەش هاتەوە وخورمای تریشی برد، ئەویش زۆرسەری سوڕما لەکردەوەی باڵندەکە گووتی ئەوجارە بگەڕێتەوە دەچم بەشوێنی بزانم ئەم هەموو خورمایەی بۆچیە؟ بۆکوێی دەبات. دیسان هاتەوە ، ئەویش دوای کەوت تاگەیشتە دارێکی بەرز سەیری کرد چووە ناو کونێك کەلەقەدی دارەکە بوو. بەهەر شێوەیەك بێت خۆی گەیاندە سەردارەکەو سەیری ناو کونەکەی کرد سەری سوڕما وزۆری نەمابوو

بکەوێتە خوارەوە ، چوونکە ئەوی کەبینی باوەڕنەدەکرا ،مارێکی گەورە لەویٚ بوو ترسا بەلاٚم کەبەجوانی دیقەتی دا بینی مارەکە کوێر بوو! ئەوبالٚندەیە ئەم خورمایانەی دەهێنا دەیدا بەومارە کوێرە. لەسەر دارەکە هاتە خوارەوە. گریا ولۆمەی خۆی دەکرد ودەپاڕایەوە و دەیگووت : خەسارەت مەند خۆمم ئەگەر خوا مارێکی کوێری ناو قەدی دار لەبیر نەکات من چۆن لەبیر ددکات . من زۆرنەزانم دەمگووت ئەگەر ڕێگری نەکەم لەبرسان دەمرم من هیچ کاێك نازانم تابیکەم وخۆمی پیٚ بژیینم هەروام دەزانی ڕزق و ڕۆزی بەهێزوو بازوو دەستدەکەوێت، دەگریاو هەروای دەگووت . سوپاسی خوای کرد کەبەم بالٚندەیە چاوی کردەوە بۆ بەدواداچونەوەیەك لەژیانی،

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

إِنَّهَا لَإِحْدَى ٱلْكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرًا لِّلْبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَتَقَدَّمَ أَوْ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ صدق الله العظيم {مدثر}

واتا: {ئەودۆزەخە شتێکی زۆر سامناك وگەورەو ترسناکە} {بۆبێدارکردنەوەی سەرجەم خەڵکانە} {جائیتر ئەوەی دەیەوێت بابەرەو پێش بچێت(پێش برکی بکات لەچاکە کاریدا)یان خۆی دوا بخات(لەو بوارەدا)}ت.ئا،



## (سێبوری)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَٰثًا ۖ وَيَجْعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًا ۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٥٠﴾ صدق الله العظيم ﴿الشورى﴾

**واتا: {هەموو ئاسمانەکان و زەویش خوا خاوەنیەتی، هەرچی بوێت دروستی دەکات،بەهەرکەس کەبیەوێت تەنها کچ دەبەخشێت، وەبەهەرکەس کەبیەوێت کــوڕ دەبەخــشێت.} {یــاخود لەهــەردووجۆر لــەکوڕوکچ (هەیــشە ویــستی خوایــە)لەهیــچی نــەدانێ ونــەزۆك بێــت، بەڕاســتی ئەوزاتــە زۆر زانــاو بەدەسەلاَتە،} ت.ئا.**

**_(ف)و(ك)١٢ســاڵ بــوو ژیــانی هاوســەریان پێكهێنــابوو زۆربەختــەوەربوون یــەکتریان زۆر خۆشدەویــست . لــەماڵ وســامان وخۆشــی دونیــا لەهیــچیان کــەم نەبوو .تەنها ئەوەنەبێ کەمنداڵیان نەبوو! هەرجێگایەك بیان گوتایە باشە زوو دەچوون وەهیچ دکتۆرێك نەما ئەوان نەچن بۆلای بەلاَم فایدەی نەبوو. ڕۆژێك (ف)بەخێزانەکەی گووت بەنیازم ژن بێنم؟**

**(ك)گووتی دەمزانی ڕۆژێکی وادێت تۆ ئەو کارە بکەی.**

**(ف)تۆباش دەزانی دکتۆرەکان گووتیان من هیچ عەیبێکم نیە؟**

**(ك)بەلاَم دکتۆرەکان نەیان گووت من عەیبم هەیە.ئەگەر خودای گەورە منداڵمان پێ نادات بۆچی یەکتر خەتاباربکەین .من پێم ناخۆش نیە ژن بێنی بەلاَم جێم مەیەڵە لێم دوورمەکەوە ماڵێکی تر بنیاد مەنێ هەر لەگەڵ مندا بژین.**

**(ف)ئەی ئەگەرئەو ژنەی من بەتەمام بیهێنم ڕازی نەبوو؟**

(ك)دەستی بەگریان کردوو گووتی بۆناڵێی کەدۆزیوەتەوەو منیش دواین کەسم کەپێم دەڵیی .من ئاوا زوو بومە بێگانە؟

(ف)ڕاستیەکەی دایکم کچێکی ناسیاوی خۆمانی دەست نیشان کردوە بەڵام تائێستا قسەمان لەگەڵیان نەکردوە . نازانین ڕازی دەبن یان نا. حەزم کرد پێش ئەوەی لەگەڵ ئەوان قسەبکەین تۆبزانی ؟ تۆچی دەڵیی؟

(ف)من ڕازیم چونکە خۆشی تۆم دەوێت تەنها لێم دوور مەکەوە لەبەر ئەو من لەیاد مەکە تکات لێدەکەم.

مانگێکی پێچوو (ف)ژنی گواستەوە . هەرسێکیان بەیەکەوە لەخانوێك دەژیان (ك)زۆری خۆشدەویست . بۆهەموو شوێنێك بەیەکەوە دەڕۆیشتن . بۆماوەیەکی کەمیش بەبێ یەکتر نەیاندەتوانی . بەڵام سێ ساڵ تێپەڕی ژنەبچوکەکەش هەر منداڵی نەبوو. (ك)نەخۆش کەوت چوون بۆلای دکتۆر دوای پشکنین دەرکەوت کەوا سکی هەیە پاش تێپەڕبوونی١٥ساڵ هاوسەرگیری هەواڵێکی چاوەڕوان نەکراوبوو موژدەیەکی خۆشبوو. کەباوەڕکردنی سەخت بوو بەڵام ڕاستیەکی دڵڕفێن بوو،بەهەردوکیان خزمەتیان دەکرد(ف)بەخێزانە بچوکەکەی دەووت تەنها ئاگاداریبە هەرچی داوابکەی بەچاوان بۆتی دەهێنم بۆتی دەکرم ئەگەر لەدەرەوەی وولاتیش بێت. ئەویش زۆربە چاکی ئاگاداری بوو .نۆمانگی چاوەڕوانی ببوو بە نۆساڵ. کچێکی زۆر جوانی بوو ناویان نا(سێبوری)زۆریان خۆش دەویست . باوکی وهەردوو دایکی خزمەتیان دەکرد. بەناز گەورە بوومنداڵێکی زۆر خۆێن شیرین بوو هەرکەسێك بۆیەك جار چاوی پێکەوتایە خۆشی دەویست (منداڵی ئاسایی خۆشەویستە ئەی ئەومنداڵەی دوودایکی هەبێ ودوای ١٥ساڵ چاوەڕوانی بێتەدونیاوە ئێوەبڵێن دەبێ چۆن بێ؟وەچۆن خزمەت بکرێت)بەڵام ئەوەی ڕویدا زۆر دڵتەزێن بوو . کاتێك تەمەنی گەیشتە سێ ساڵ. ڕۆژێکیان باوکی بۆسەرکار دەڕۆیشت .سێبوری کەوتە دوای بەگریان چونکە زۆربەنازبوو داوای دەکرد لەگەڵ خۆی بیبات . باوکی پارەی

داپیَی ووتی برۆ بۆخۆت شت بکڕە (دوکانێکیان لەتەنیشت ماڵ بوو بۆ ئەوێ ڕەوانی کرد)بەدایکی سێبوری گووت وەرە دەرگام بۆبکەوە تاسێبوری نەگەڕاوەتەوە سەیارەکە دەرکەم و بڕۆم نەوەك دووبارە دەکاتەوە گریان داوادەکات لەگەڵ خۆمی ببەم.ئەویش دەرگای بۆکردەوە سەیارەکەی بردە دەرەوە لەوکاتە تەلەفۆنێکی بۆهات. وەڵامی دایەوە .بانگی کرد(ك)ئەوە براکەمە سلاوی هەیە بۆتان . لەم سەین وبەینە ئاگایان لەسێبوری نەما ئەویش لەم کاتە بسکیتی کڕیبوو سەیارەکەش وەستابوو لەبەر دەرگا چووبو لەدواوە دانیشتبوو .

(ف)سێبوری هاتەوە؟

(ك) ئاگادارنیم . سەیری ژوورەوەی کرد دیارنەبوو وتی دەزانم تائێستا لەدوکانەکەیە هەموو جار وادەکات نازانی چیهەڵگرێ .دەچم سەیرێکی دەکەم .

(ف)گووتی باشە برۆ بیهێنەوە منیش دەڕۆم تانەگەڕاوەتەوە. بۆدواوە ڕۆیشت هەستی بەشتێك کرد لەژێر تایەیی سەیارەکە. هاوسێکان هاواریان کرد بوەستە بوەستە ئەوە تۆ چی دەکەی .لەسەیارەکە دابەزی بەخێرایی چی ببینی ! ئەوەسێبوریە لەژێر سەیارەکەیە کەهەڵیان گرت گیانی لەبەر دانەمابوو بسکیتەکەی کەوا کڕیبوی هەندێکی لەدەمدابوو پارچەکەی تریشی لەدەستبوو. دایکی بەڕاکردن لەلای دوکانەکە هاتەوە ووتی سێبوری لەوێ نەبوو نازانم چووە بۆکوێ ئەم قەڵەباڵغیە چیە سێبوری لەکوێیە.(ف)لەسەری خۆیدەدا ودەیگووت بۆی مەگەڕێ ئەوەتە سێبوریەکەی من وتۆ .ئەوەتەگیانی لەبەردانەماوە من کوشتم من کوشتم. (ك)کەسێبوری بینی بەوجۆرە بورایەوە کەوتە سەر زەوی(تاماوەیەکی زۆر لەنەخۆشخانە مایەوە بۆ چارەسەرکردن ).(ف)لەلای دکتۆرێکی (نەفسی)تا دووساڵ چارەسەردەکرا، هەردەم دەیگووت من کوشتم!

# ڕازیبوون بەهەموو نەهامەتیەکی ژیان

(ت)پیاوێکی تەمەن چل سالّی بوو کاسب کاربوو بەلّام ئەوەی بەدەستی دەکەوت کەم بوو قەناعەتی پێ نەدەهات ، بەلاّم هەر ئەوەی دەزانی کەبیکات ئەویش کاری سەرپێی بوو، ڕۆژێك زۆر ڕاوەستا لەبازار شتێ بکڕێ بەلّکو قازانجێك بکات ئەگەر کەمیش بێ تەنها بتوانێ دلّی منداڵەکانی خۆش بکات. زۆر وەستا دوایی بێزاربوو لەوەستان . کات نزیکی کرد بەرەو نیوەڕۆ ئەویش وردە وردە بەرەو مزگەوت کەوتە ڕێ ، چوو دەسنوێژی هەلّگرت و لەسوچێکی مزگەوت دانیشت چاوەڕیی بانگ بوو ، بەلاّم خەیالّی بەرەو دوور ڕۆیی، لەدلّی خۆی دەیووت باشە چیدەبوو ئەگەر خوای گەورە منی دەولّەمەند کردبوایە. خوا دەولّەمەندە هیچ لەخەزینەی کەم نەدەبوو ئەگەر مالّ وسەروەتێکی زۆری پێ بدابومایە، باشە بۆ هەن لەبەر زۆری مالّ نازانن چی بخۆن وچی لەبەرکەن وسەفەرو سەیران وخۆشی و ڕابواردن لەهیچیان کەم نیە. نوێژیش ناکەن وە ناشزانن ئیمان وباوەڕ چیە کەچی خوالەبیریان ناکات وهەر بەسەریان دادەبارێنی ، منیش ئەوەندە پیاوێکی باشم وە نوێژدەکەم هەردەم نانی ڕۆژێ بەڕۆژیم بەحالّ دەست دەکەوێت، (خەریك بوو دلّی خەتەرەی دەکرد)لەناکاو بینی پیاوێکی پیری بەساڵاچوو هاتە ناو مزگەوت قاچێکوو دەستێکی نەبوو منداڵێکی تەمەن دە ساڵان دەستی گرتبوو بەپشتێنی پیاوە پیرەکە، سەرەتا وای زانی منداڵەکە خۆی بەئەو گرتووە دوای سەرنجی دا بینی بەڵکوو پیاوەکە نابینایە لەبەر ئەوە منداڵەکە پشتێنی گرتووە بۆئەوەی بیگەیەنی بەمزگەوت (ت)زۆر سەیری پێهات لەدلّی خۆیدا گووتی ئەم هەموو نوقصانیە وبەوحالّەش هاتۆتە مزگەوت بۆنوێژ سەیرە! بینی پیرەمێردەکە دوورکات نوێژی(تحیە المسجد)ی کرد دوایی دەستی بەرز کردەوە دەپاڕایەوە (ت)لەبەر خۆی دەیگووت ئاخ تۆش لەمن بێزارتری لەژیان ، بەلاّم لەبەر چی دەپاڕێتەوە داوای چی دەکات هیچی تیاماوە بۆی بپاڕێتەوە چاوە هەرنیەتی، قاچە هەرنیەتی ،

دەست هەروا، تەمەنی پیریش لەولاوە ؟ باشە ئەمەچۆن دەژی چۆن ڕۆژگارەکان بەڕێ دەکات ، گوێی شل کرد بۆی تابزانی چ دوعایەك دەکات ، ئەویش دەپاڕایەوە دەیووت خوایە زۆر شەرمەزاری تۆم ،تۆ ئەم هەموونیعمەتەت بەمن داوە ئەم هەمووچاکەیەت لەگەڵم کردووە ئەگەر تۆ ئەوەندە بەبەزەیی نەبوای ئێمەی ئادەمیزاد چیمان دەکرد ! (ت)نەیتوانی زیاتر گوێ ڕابگرێ ووتی بەڕاستی تۆ هەر نوقصان نی بەڵکو شێتیشی چ نیعمەتێکە چ چاکەیەکە ئەوەی تۆ باسی دەکەی پێم بڵێ تۆهیچت ماوە کەمرۆڤی ئاسایی هەیبی تۆ باسی چی دەکەی؟ مامەپیرەکەش گووتی کوڕم تۆ چۆن لەژیان گەیشتووی تۆ وادەزانی ئێمە تەنها بۆڕابواردن و خواردن وخەوتن دەژین ، نیعمەتەکانی خوای گەورە بەمنی داوە زۆرە من ناتوانم بیان ژمێرم وادەزانی تەنها دەست وقاچ وچاو لەمرۆڤ بەکەڵکن، ئەگەر هۆشم نەبوایە بیر بکەمەوە .ئەگەر زبانم نەبوایە وەڵامت بدەمەوە. ئەگەر گوێم لەقسەکانت نەبوایە ئەگەر دەستەکەی ترو قاچەکەی تریشم نەبوایە هیچم پێدەکرا لەگەڵ خوای خۆم ، کوڕم قاچێك بەرەو شوێنی خراپت ببات چۆن قاچێکە زبانێك توشی قسەی ناحەقت بکات چی، یان چاوێك توشی نەزەرت بکات ،ئەی نیعمەتی ڕزق و ڕۆزیم، من ناڵێم ئەگەر ئەوانەم هەبێ خراپە.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٦٤﴾ صدق الله العظيم ﴿العنكبوت﴾

واتا {بێگومان ژیانی ئەم دونیایەجگە لەگەمەو گاڵتە ویاری شتێکی تر نیە(واتە بێ نرخەو ئەوەناژی کەئاوا پەلاماری دەدەن وستەم لەپیناویدا دەکەن)چونکە بەڕاستی ماڵی قیامەت وژیانی ناو بەهەشت ژیان

وزیندەگییەو(شایستەی ئەوەنیە کەئادەمیزاد هەولْ وکۆششی بۆ بدات، ئەگەر (ئەوخەلْکە)بزانن وتێبگەن.}ت.ئا. بەلاّم زۆرن ئەوانەی حەقی ئەوئەندامانەی نادات، ڕۆلّە کەسانێك هەن ئەگەر تەنها نەخۆشیەکی کاتی توشی دێت نوێژ ناکات منەت دەکات لەسەر خوا،یان ئەندامێکی بچوکی لەدەست دەدات ناشوکری دەکات ، ئەم هەموو نیعەتانە لەبەر یەکێان لەبیر دەکات

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨﴾ صدق الله العظيم نحل

واتا{ خۆ ئەگەر بتانەوێ نازو نیعمەتەکانی خوا بژمێرن ، بۆتان ناژمێردرێت(لەئەندامەکانی دەرەوەو ناوەوەی خۆتان وئەو رزق وڕۆزیانەی کە دەیخۆن وئەوپۆشاك ورایەخ وناومالّەی کەبەکاری دەهێنن..هتسەرەڕای هەزاران هەزار دروستکراوانی تری دیارو نادیار لەجیهانی مادە وڕووەك وگیاندارو..هتد)سەرەڕای کەم سوپاسی و ناسوپاسیتان لەهەموو نازو نیعمەتەبێژماری)خوای پەروەردگارهەر لیخۆشبوو میهرەبانە}ت.ئا.}

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسٗا ﴿٨٣﴾ صدق الله العظيم {اسرا}

واتا:{هەرکاتی نازو نیعمەت دەبەخشین بەئینسانی (بێ دین)ڕوو وەردەگێری وفیزدەکات وهەر خەمخۆری خۆیەتی . کاتێکیش تووشی ناخۆشیەك وتەنگانەهات نائومێدو پەست وغەمگینە}ت.ئا،

وتی: کوڕم دەوڵەمەندی مالْ وسامان بۆی هەیە بەڕێزوو بەرزت بکات لەناو خەلْك. بەلاّم کاتیە! بەلاّم ناسینی خوداوئاشنابوون بەدانان وکردەوەکانی .

ڕازیی بوون بەهەموو پێ دان وپێنەدانی لەهەموو شتێ (خۆشی.ناخۆشی، هەبوون ونەبوون، هتد.)دەتگەیەنی بەژیانێکی بێ کۆتایی ئەم ژیانەی تیایدایی زوو کۆتایی دێت لەچاوو دونیاکەی تر کەنەبڕاوەیە، مامە پیرەی شوکر وقانع زۆر ڕازیبوو بەدانانی خودا زۆری بۆ باسکرد،(ت)لەگەڵ قسەوباسەکانی زۆر دڵی کرایەوە، ووتی : ڕاستە من بەهەڵە لەژیان گەیشتبووم هەوڵم هەموو بۆژیانی دونیابوو من لەبەر پەیاکردنی پارەونان دونیاکەی ترم پشت گوێ خستووە کەتەنها ئەویش سەرمایەیە، وام دەزانی ئیمان ئەوەیە نوێژبکەی و بڵێی باوەڕدارم.



## (باوکــی کچــەکان)

پیـاوێکی ئاقڵ وژیـر لەگـەڵ منداڵـەکانی وخێزانەکـەی لەیـەکێك لەگەڕەکـەکانی شـاری هـەولێر دەژیـا (٧)کـچی جـوانی هـەبوو.مـاڵ وسـامانێکی زۆری هـەبوو .خـاوەن دڵێکـی گـەورە بـوو زۆریارمـەتی هـەژاروو نـەداری دەدا . کـچەکانی زۆرخۆش دەویـست هـەردەم دەیگـووت ئـەم هـەموو نیعمەتـەی خودا پێـی داوم لەبـەر کـچەکانمە. هەرچـەند بـرای نـەبوو بـەڵام دووخوشـکی هـەبوو .زۆرجـار خوشکە گەورەکەی پێی دەگووت : برام ژنێکی تر بێنە تۆکوڕت نیە وادیارە ئـەم ژنـەت هـەر کـچی دەبێـت هـەتا گـەنجی خـەمێك لـەخۆت بخۆ ئەوماڵ و سامانەت بۆکێ بەجێدەهێڵی پاش عومرێکی درێژ. ئـەویش دەیووت خوشـکم ئەگـەر خوا ویستی لەسەر بوایە کوڕی دەدامی وەك چۆن کچی داوە پێم،تۆ بۆ واز ناهێنی هەرکـە مـن دەبـینی ئەوقـسانە دووبـارە دەکەیتـەوە . منـیش هـەر دەڵـێم نـا ژن ناهێنم .

دیـسان خێزانەکـەی سـکی بـوو زۆر دەپاڕایـەوە بـەڵکو ئـەمجارە کـوڕی ببـی . دەیگـووت ئـەمجارە کوڕم نـەبێ خوشـکەکەی بـەزۆر ژنـی بۆدەهێنێ . مانگـەکان تێپـەڕین ئـەوڕۆژە هـات کەچاوەڕوانیان دەکـرد.خێزانەکـەی نەخۆشـ تەلـەفۆنی کرد بۆخوشکەکانی هاتن، بـەڵام هەرلـەدەرگاوە خوشـکەگەورەکەی گـوتی ئـەوە دواین جارە ئەگەر کوڕی نەبێ ڕازی نابم بەم وەزعە بزانە؟ نـەیتوانی زیـاتر گـوێ بۆقسەکانی ڕابگرێـت گـوتی دەچمە دەرەوە ئەگـەر شـتێ ڕویـدا پـێم ڕاگەیـەنن. دوای چـەند کاتـژمێرێك خوشـکەکەی تەلـەفۆنی بـۆکرد ووتـی :ئـەوە بـۆڕاتکرد دەتزانـی کـچە وانیـە . ئـەویش گـوتی جـارێ تـۆ بڵـێ خوالێـت نەسـتێنێ تەمـەن درێژبێ .

گووتی وانـاڵێم تـەنها دەڵـێم بەتـەمای چـی؟ ئەویش بەپێکەنینـەوە گـووتی بـەڵێ وایــە باشــبوو بــەبیرت هێنامــەوە بەتــەمام بــچم گایــەك بکــرم وبیکــەم بــەخێر بۆکچەکەم ودایکی. نەگەڕایەوە بۆماڵ تاخێرەکەی کرد.

کەگەڕایەوە ماڵ سەیری ژنەکەی کرد دەگریا ، چووبۆلای و گـووتی مـن وامزانـی تەنها من دڵخۆشـم نـەمزانی تۆلـەمن دڵخۆشـتری لەخۆشـیان دەگـری.خێزانەکەی ووتی من دڵخۆش نیم بەڵکۆ زۆریش دڵتەنگم حەزم دەکرد کوڕێکت بۆبێنم بـەڵام

چیبکەم دیسان کچ بوو. باوکی کچەکان گوتی استغفرالله تۆناتوانی کوڕم بۆبێنی .من هیچ کات دڵتەنگ نیم بەکچەکانم. خێزانەکەی ووتی بەلاّم خوشکەکەت هەردەم ئەوە دەخاتە ملی منەوە . ئەوکات ووتی کەی وەختی ئەم قسە بێ مانایانەیە تۆجارێ ئەم گوڵەم بدەرێ بزانم وەك تۆجوانە یان لەباوکە ناشیرینەکەی دەچێت. لەباوەشی گرت وماچی کرد سێ جار لەبن گوێچکەی بانگیدا چەند صورەتێکی لەسەر خوێند ووتی ناوی دەنێم (فریشتە) چونکە زۆر جوانە شێوەی لەفریشتە دەچێ .!

خوشکی ئەم پیاوە کوڕێکی گەورەی هەبوو ڕۆژێك ناردی بەدوای براکەی گووتی ژن بۆکوڕەکەم مارە دەکەین. ئەویش دڵخۆش بوو هەموو مصروفی مارەبڕینەکەی خستەسەر ئەستۆی خۆی . هەروەها بۆگواستنەوەوشایی زۆر یارمەتی دان ئەوەی لەتوانای دابوایە بۆ خوشکەکانی دەیکرد وکەمتەرخەمی نەدەکرد. بەلاّم خوشکەکەی قسەکانی هەردەم دووبارە دەکردەوە . ڕۆژێکیان گوتی براکەم ئێستا بووکەکەم حەملی هەیە دەزانی ئەگەر کوڕی ببێ چەند خەم دەخۆم بۆتۆ. کوڕەکەم ببێ بەخاوەن کوڕ تۆش تەنها خاڵی ئەوی کوڕت نیە تەنها ٨کچ نەبێ . ئەویش زۆرپەست دەبوو بەم قسانە دەیگووت ئەگەر نەڵێن پیاوێکی خراپە وپشتی لەخوشکی کردووە لەژیانمدا قسەم لەگەڵ نەدەکردی خوا هیدایەتت بدات خوای گەورە دەرست بدات .

بووکی خوشکەکەی منداڵی بوو خۆزگە نەیبوایە . ڕاستەکوڕێکی بوو بەلاّم چۆن منداڵێك بوو (دووسەری هەبوو لەگەڵ سێ قاچ وچوار دەست)منداڵێکی ئاسایی بوو لەخواردن وخەوتن وگریان پشکنینی زۆریان بۆی کرد تابزانن ئەگەری مانەوەی لەژیاندا چەندە. نەیانزانی. دوای سێ مانگ منداڵەکە مرد پاش ئەوەی ماندوبونێکی زۆرو خەم وخەفەت ومصروفێکی زۆر. براکەی وبراژنەکەی هاتن بۆلایان دڵیان بدەنەوە . براکەی گووتی هەر کارێك خودا بیکات دەبێ ئادەمیزاد پێی شوکربێت چونکە ئێمەی بێدەسەلاّت هیچمان لەدەست نایەت ئەگەر خوا ویستی لەسەر نەبێ چیت ووت خوشکی گەورەم؟ ئەویش وەلاّمی دایەوە بەگریانەوە بەڵێ وایە . من زۆر شەرمەزارم بەرانبەر ئێوە داواتان لێدەکەم لێم خۆشبن دڵتان گەورەیە توخا بم بەخشن! براکەی ووتی :

داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە خوشکە گیان من ڕازییم بەبەشم من هەشت کچم هەیە وادەزانم کەلەماڵەکەم هەشت پەپولە دەسوڕێتەوە هیچ کات دڵم تەنگ نەبوە بەوان من شوکری خودا دەکەم چونکە نازانم چی باشە بۆم هەردەم داوادەکەم لەخودا ئەوەی باشە بیکاتە نسیبم دیارە ئەوە باشە بۆم من ڕازیم.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ صدق الله العظيم {حديد}

واتا {چاك بزانن كەژیانی دنیا تەنها بریتیە لەیاری وگەمەو رازاندنەوەو خۆهەڵكیشان لەنێوانتاندا هەروەها زۆركردنی سامان وماڵ ومنداڵ (جائەوانەی هەرهەموی)وەك بارانێكی بەپیت وایە كەببێتە هۆی بەرهەمێكی زۆر،كشتكارەكان پێی سەرسام بن، لەوەودا وشك ببێ وزەرد هەڵدەگەڕێت، پاشان وردوخاش ببێت وبكەوێت،بێگومان لەقیامەتیشدا سزای زۆرسەخت بۆدونیا پەرستان ئامادەیە، (لەولاوەش) لێخۆشبوون وڕەزامەندی لەلایەن خواوە (ئیماندارانی چاكەخوازی لێ بەهرەوەر دەكرێت)،ژیانی دنیاش(دوورلەخواناسی ودینداریی)جگە لەوەی كەبریتیە لە ڕابواردنێكی كەم وزۆر كەسی پێی غەڕاو دەستخەڕۆ دەبێت، شتێكی تر نیە،}ت.ئا



## (بابەتی هەشتەم)
# (ئامۆژگاریە گرینگەکان)
## {نصائح مهمة}

ئادەمیزاد خۆی خولقەتێکی جوانی هەیە بەلاّم زۆر بەپەرۆشەوە دەلّێم خۆزگە ئەخلاقیشی جوان بوایە . هەندێ رەوشتی ئادەمیزاد هەیە چواردەوری دلّ شکاوو ناهومێد دەکات. هەندێکیان باس دەکەین بەلّکوو بتوانین ببین بەئاوینەیەك بۆ ئەوەی بتوانن هەلّەکانتان بدۆزنەوە . پێش ئەوەی کەس رای خۆی بەرامبەرت بلّێ کەتۆ چۆن کەسێکی خۆت هەلّسەنگێنە .هەلّەکانت چاك بکەوە ئەگەر زانیت تۆش هەلّەت هەیە پێویستت بەگۆرانکاریەك هەیە لە ژیانت؟.

_دلّ شکاندن

_خۆبەزل زانیین

_تاوان بارکردن بەناحەق

_سوێندخواردن

_چاوپۆشین لەهەلّە

_دوو روویی ودووزمانی

_چاوبرین بۆمالّی خەلّك

_بەدەر خستنی نهێنی

_بەسۆزەوە سەیرکردنی بچووك ورێزدانان بۆگەورە

_پاراستنی ئابروو ناموسی خەلّك

_راستی وراست گۆیی

_چاکە وخراپە

_کێ شایستەیە کەلێی بترسی

_نیەتی باش ونیەتی خراپ

_ڕەوشت جوانی

_ڕژدبوون لەسەر قسەوباس

_بێ ئومید بوون لە ڕەحمەتی خوا

_گوڵ بریتیە لەچیی؟

_زۆربوون مایەی دڵە ڕاوکێ یە

_گوێ پێ نەدان

ئێستا باسی ئەوخاڵانە دەکەین بەکورتی کەلەسەرەوە باسمان کرد .بزانیین هەڵەکانمان چیە بەووردی.

ئایا ؟ تۆئەم جۆرە ئادەمیزادانە دەناسی.

ئایا؟ تاچ ڕادەیەك تۆ لەخۆت ڕازیت.

ئایا؟ تۆجۆرێك نیت لەوان. تاچەند لەهەڵەی بەرامبەرەکانمان دەرس وئامۆژگاری فێربوین و هەڵەکانی خۆمان پێی چاك کردۆتەوە؟ تاچەند هەوڵمان داوە بەرامبەرەکەمان چاك بکەین.؟



## دڵ شکاندن

زۆرجار دڵی خەڵکانیکمان شکاندوە وەهەستیشمان پێی نەکردوە . تەنها ئەوکات نەبێ کەبەسەرخۆمان هاتووە. هەوڵ بدە لەئازاری بەرامبەرەکەت تێبگەی بۆئەوەی لەکاتی گفتوگۆدا دڵشکاوی نەکەی(هەردەم ببە بەگوڵێکی بۆن خۆش و سودبەخش مەبە بەدرگ ئازاردەروو زیان بەخش)سەرنج بدە بزانە کەس لەژیانیدا لەدڵ شکانی خەڵك هیچ قازانجی کردوە تەنها ناشیرین وخەسارەت مەندبووە .جارێك دووکەس بەیەك دەگەن کەناسیاوو خزمی یەکن .یەکێکیان تۆزی غریبەوهەندێکیش شرە لەجلووبەرگدا .ئەوەی تریش هەرچەندەلایەنی ماددی هەر وەك ئەوبوو بەلاّم گورج وگۆڵە.غەریبەکە زۆرتەکلیف دەکات بچینەوە بۆماڵمان خزمەتت دەکەم بەچاوان زۆرهەوڵدەدات بەلاّم بێ فایدەیە ئەوهەر ڕازی نابێت بچێت لەگەڵیدا. تائێرە باسەکە ئیعتیادیە بەلاّم ئەوەی سەیرە .ئەم پیاوە کەڕازیش نابێت لەگەڵی بچێتەوە کەچی زۆر بێ شەرمانە دەڵێ توخدا تۆبەخۆت ئاوا شڕیی دەبێ ماڵەکەت چۆنبێ من چۆن دەتوانم شتی تۆ بخۆم کەناتوانم سەیرت بکەم ، چۆن دڵ شکانێکە ئەوەی کەکردی؟

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا بِأَحْسَنَ مِنْهَا أَوْ رُدُّوهَا ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾ صدق الله العظيم {النساء}

واتا: {هەرکاتێ سەلام وچاك وچۆنیەکتان لەگەڵدا کرا ئەوە بەجوانترین شێوە وەلاّم بدەنەوە یاخود(هیچ نەبێت)وەك خۆی، بێگومان خوا لەهەموو شتێك دەپرسێتەوە} ت.ئا.جۆرەکانی دڵشکاندن زۆرە کەباس کردنیان کاتی زۆری دەوێ، بەکورتی باسێکی تر دەکەین. ماوەی چەند ساڵێك بەر لەئێستا ئافرەتێك

نەخۆش کەوت پیاوەکەی بەماوەی مانگێك بردی بۆلای شەش_حەوت دکتۆر. باشتر نەبوو ڕۆژ لەڕۆژ هەستی بەئازاری زیاتر دەکرد. هەردکتۆرێك جۆرێك عیلاجی بۆدادەنا . تاخودای گەورە شیفای نارد و باش بوو. بەلأم جاری واهەیە ئازاری دەروونی سەخت ترە لە ئازاری جەستەیی ! ئەم پیاوە ڕۆژانە دلَی هاوسەرەکەی دەشکاندوئازاری دەدا،(٤٠٠٠) دیناری سویسری. کەدەکاتە(٦٠٠٠٠٠)هەزاری ئێستا.هەردەم دەیگووت ئەم هەموپارەم دایە دکتۆرو دەرمان وسونار بەبەلاش دوای ماوەیەك باشدەبووی .ئەوهەموو ئازارە کەهاوسەرەکەی دەیکێشا چونکە لەجەستەی ئەونەبوو هەستی پێنەدەکرد .ئەوەی گرنگ بوو لای ئەو پارەکەبوو . چەند سالَێك بەسەر ئەوە تێپەڕی بەلأم ناوە بەناوە بە هاوسەرەکەی دەگووت بەبیرت دێت کە نەخۆش بووی ئەم هەموو پارەیەم بۆت سەرف کرد. هەندێ جار وەلأمی دەدایەوە دەیگووت تاکەی ئەوە لەبیرناکەی ئەگەر نەخۆشیەکی وام بوایە پێویستی بەچارەسەر بوایە لەدەرەوەی وولأت چیت دەکرد خەلَکانێك بۆچارەسەری خێزان ومندالَیان خانوو دەفرۆشن مالَ دەفرۆشن بۆسەلامەتیان. تاکەی ئەوەبەچاوی من دادەدەیتەوە! خوای گەورە وای کرد دوای ماوەیەك زەرەر لەدوای زەرەر ڕویی تێبکات. خانووی نەما مالَی نەما زۆریش قەرزار بوو . بێ ئەوەی دەستی کەسی تێدابێت تەنها بەویستی خودا،! خەلَك چاکە لەگەلَ یەکتری دەکەن بەڕووی یەکتری دانادەنەوە . ئەی چۆن توانی ئەوەندە ئازاری هەستی هاوسەری بدات کەلەخۆشی وناخۆشی لەگەلَی دایە.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ ﴿٣٩﴾ وَجَزَٰٓؤُاْ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ صدق الله العظيم {الشورى}

واتا {هەروەها ئەوانەی دەست درێژیان کرایە سەر(وەك قسەو هتد)دەسەوەسان ناوەستن وبەرگریی لەخۆیان دەکەن} {جاتۆڵەی هەرتاوانێك بەئەندازەی تاوانەکەیە (بێ زیادوکەم) خۆئەگەر کەسێك لێخۆشبونی هەبێ وچاوپۆشی بکات ئەوە پاداشتی لای خوایە،بەڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت،}ت،ئا.



## خۆبەزل زانینه

ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەرەوە درودی خوای لەسەربۆمان دەگێڕیتەوە دەفەرموێ (دەوڵەمەندی بەشتی زۆر نیە بەڵکو دەوڵەمەندی ئەوەیە کەدڵ ودەروون دەوڵەمەند بێت) تەکەبورو خۆبەزل زانین بەنەخۆشیەکی کوشندەلێك دەدەمەوە. وادامەنی تۆزۆرجوانی مەزانە تۆلەهەمووکەس زیرەکتری مەلی من ١٠دەوڵەمەندم مەلی من بەتوانام !دەسەلات ودەوڵەمەندی وزیرەکی وجوانی و..هتد، هیچیان هەتا سەرنین، تەمەنی ئادەمیزاد بەسەر دەچێت وکۆتایی پێی دێت کەچی تۆش بیرلەشتی کاتی دەکەیتەوەو خۆتی پێی سەرقاڵ دەکەیت وفیز و تەکەبور لیدەدەی بەشتێك کەسایستەنیە کەواخۆتی بۆبکوژی ئەویش (خۆبەزل زانینە)، لەپێغەمبەرەوە درودی خوای لەسەر بۆمان دەگێڕنەوە دەفەرموێ(ئادەمیزاد پیردەبێ کەچی دووشت تییایدا هەرگەنجە!پەرۆشی بۆماڵ وسامان! پەرۆشی تەمەن درێژی) لوقمانی حکیم بەکوڕەکەی ووت کە لەقورئان بۆمان روون دەکاتەوە خودای گەورە دەفەرموێ (لەسورە لقمان ایە١٨)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ صدق اللة العظيم ( لقمان)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ صدق اللة العظيم { قصص}

واتا: {(جائیتر باخەڵکی دڵنیابن)، کەئەو ماڵی قیامەتە و(بەهەشتی بەرینـەمان) ئامـــادەکردووە بـــۆ ئەوکەســـانەی کەنەبـــەرزیی وگـــەورەییان دەوێـــت لەزەویدا،نەفەســـادو گونـــاه وخراپـــە، ســـەرئەنجام و(ســـەرفرازیش) هـــەربۆ پارێزگاران وخواناسانە.}ت،ئا.

## تاوان بارکردنە بەناحەق

ئەوەی باسی دەکەم بەسەرخۆم هـاتووە (جارێك لـەلای خزمێکی نزیـك باسێك کرایەوە کەپەیوەندی بەکەسیٚ هەبوو کەواهەردووکمان دەمان ناسی بەڵکوو زۆر نـزیکیش بوولێمـان،منیش بۆئـەوەی باسـەکە بگـۆرم یـان ناخۆشـی پەیدانـەبێت مـەدحی ئەوکەسـەم کـرد کـەوا باسمـان دەکـرد، ڕاسـتە؟ئەولەویٚ نـەبوو بـەلاٚم خودای گـەورە لەهـەموو جێگـاو شوێنێکە.بڕوابکـەن چەند جارێك ئـەوەدووبارە دەبویەوە وەچەندساڵیش تێپەڕی تەنها بۆجارێکیش گوێبیستی قسەکانی خـۆم نەبومەوە کەبەچاکە وڕتبوم. بەلاٚم بۆتاقیکردنەوە جارێکی ترلەلای هەمان کـەس زەمـی ئەوکەسـەم کردکـەوا چـەندجاری پێـشوومەدحم دەکـرد. بڕوابکـەن دوو ڕۆژی نەخایەند هەموو قسەکانی پیٚ گەیشتەوە تەنها ئەوەندەش نا بـەڵکو سیٚ ئەوەندەشـی لەلایـەن خـۆی بۆزیـاد کردبـوو . بۆماوەیـەکی زۆر دڵمـان لەیـەکتر ڕەنجـا، چـاك دەزانـــن ئـــادەمیزاد چـــۆن دروســـت کـــراوە کـــەدەتوانی ئـــەم هـــەموو(پیـسایيە) لەناوسـکی هـەڵبگرێت نـاتوانی چەندقـسەیەك هـەڵگرێت. دەگەڕێتەوە بۆ لەخوا نەترسی وبێباکی لەتێکدانی خزمایەتی، ئەوەش بەمرۆڤی (خراپ دەکرێت). تاوان بارکردن جۆری هەیـە !ناسیاوێکمان پەیوەندی دەکات بەماڵی برایەکی دەڵی ئەگەر لەماڵ بن ڕۆژی هـەینی دێین بۆسـەردانتان بەینێکە یـەکتریمان نـەبینیوە بیرتـان دەکەین؟براکـەی دەڵـیٚ بـەڵیٚ لـەماڵین نیـازی هـیچ شوێنیکمان نیە لەئێستاوە بەخێر بین. هـەینی بـوو کـات ژمێـر ١١چوون بۆلایـان لەکاتی دانیشتن ونانخواردن هاوسەری خاوەن ماڵ بە مێوانەکەی ووت بڕوابکە لەو ڕۆژەی تەلەفۆنتان کردووە ئیسراحەتمان لیٚ هەڵگیراوە ماڵ پاك کردنـەوە و

نان کردن وچوون بۆبازاڕ ئێمە سێ ڕۆژە ڕاکە ڕاکەمانە هیلاك بوین نەدەبوایە زووتر پەیوەندیتان کردبا (ئێستا ئێوە بڵێن ئەم تاوان بارکردنە ناحەق نەبوو. ئەگەر ئەم ئافرەتە کاری ڕۆژەکانی بەڕێکی ئەنجام دابوایە هەموو کارەکانی لەسەر یەك کۆمەڵ دەبوو ؟ دەڵێن کاری بەوەخت ، پاشای سەرتەخت)ئێمە زۆرکات بەخۆمان تاوان بارین بەڵام ڕاستی ناڵێن وبەحەق نادوێین

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن جَآءَكُمْ فَاسِقٌۢ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوٓاْ أَن تُصِيبُواْ قَوْمَۢا بِجَهَـٰلَةٍ فَتُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَـٰدِمِينَ ﴿٦﴾ صدق اللة العظيم {الحجرات}

واتا {ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر کەسێکی متمانە پێنەکراو هەواڵێکی بۆ هێنان(خێرا بڕوای پێ مەکە)،بەڵکو سەرنج بدەن،ایٚی بکۆڵنەوە (تابۆتان روون دەبێتەوە)،نەوەکو ئازار وناخۆشیی و گیروگرفت بۆ خەڵکی دروست بکەن بە نەزانی ، دوایی پەشیمان ببنەوە لەو کارەی کەپێی هەستاون}ت،ئا.



## سوێند خواردن

### ڕاستی و درۆ لەسوێند خواردندا.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ صدق الله العظيم

واتــا: {بەقــسەی ئەوانــە مەکــە چــوونکە زۆر ســوێند دەخۆن،بەحــەق و بەناحەق،هەروەها زۆر سوك وڕسوان}

سوێند خواردن لەلایەن ئادەمیزادی ئەمڕۆ بۆتە ئاوخواردنەوە بۆوامان لێهات؟ چوونکە دڵەکان کەم ئیمانی دایگرتووە .درۆیەکان دڵەکانیان ڕەش کردووە . بۆشتی گەورەوبچووك هانا دەبەینە بەر سوێند خواردن .هەندێك دەڵێن بەئیمانم. بەسەری فلان. بەقەبری فلان. بەوئاگرە .استغفرلله. باوەڕتان هەبێ ئەوخەڵکە لەسەر شتی بێ نرخ سوێند دەخۆن کەوا دڵی باوەڕ دار دێنێتە خرۆش،پێغەمبەر ﷺ، لەسەر فەرمویەتی (هەرکەس سوێندی خوارد باسوێند نەخوات تەنها بەخوا نەبێت، هۆزی قورەیشی، سوێندیان بە باوو باپیرانیان دەخوارد)،هاوەڵ بۆ خوا بڕیار مەدەن چوونکە تەنها خۆیەتی خاوەن دەسەڵات

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِهِۦ ۗ قُلْ تَمَتَّعُوا۟ فَإِنَّ مَصِيرَكُمْ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ صدق الله العظيم {ابراهيم}

واتا: {(خوانەناسەکان)هاوەڵ وشەریك بۆ خوا بڕیار دەدەن(بەهەموو شێوەیەك دەیانەوێ)،خەڵك وێڵ بکەن لەبەرنامەو ئاین وڕێبازی خوا، پێیان بڵێ:ڕابوێرن

و ژیان بەرنەسەر،سەرئەنجامتان بەرەو دۆزەخە.}ت،ئا. (هەمووشتێا، کەلەبازار دەیکرپیت دەبیٚ نرخەکەی بدەیت)سوێندەی ناوێت،ڕاستی شتومەکەکە بلیٚ عەیبەکانی دیاری بکە،

زۆرن ئەوانەی سوێند دەخۆن بۆماڵ ئەگەر وابکەیت بزانە بەوکردارەت بەرەکەت لەپارەو ماڵەکەت هەڵدەگری هەرچەند زۆربێت هەر بەزیاد نابیٚ، بۆیە ئاگاداری زمان بە هەموو کات سوێند مەخۆ.پێشینان ووتویانە، زمان بەلاٚی سەرە.



## چاوپۆشین لەهەڵەکان

ئەگەر چاوپۆشین لەهەڵە پێویست بوو بەواتایەکی ڕونتر گەربتوانی هەندێ هەڵەی وورد هەیە پشت گوێیان بخەی هەندێ کات باشە، تاپێتان دەکرێ وردەکان کەبەزووترین کات وکەمترین ماندووبوون چارەسەر دەکرێت پێی هەڵسە.دووهاورێت بەلەیەك نەگەیشتنێك بەینیان نەماوە تۆ ئەگەر دەتوانی ئاشتیان بکەیتەوە کەم تەرخەمی مەکە.بەلاًم هەندی هەڵەی تر هەیە کەبەهیچ جۆرێك نابێت چاوپۆشی لێبکرێت . هەندێك لەم هەلاًنە زۆر بچوکە کەچی بەتێپەڕبوونی کات گەورە دەبێت لەدوایی پەشیمان بوونەوە داد نادات (ڕۆژێك منداڵێکی تەمەن۱۲ساڵی دەسگیر کرا لەلایەن پۆلیس ؟ لێیان پرسی تۆ منداڵی بۆدزی دەکەی چیی وایکردوە تۆئەم کارە نارێکە ئەنجام بدەی؟ وۆتی کاتێك تەمەنم ۷سالاًن بوو ڕۆژێك لەکۆلاًن یاریم دەکرد هەندێ پارەم دۆزیەوە هێنامەوە بۆلای دایکم گووتم لەکۆلاًن دۆزیمەوە! ئەویش بەدڵێکی شادو پێکەنینەوە لەمنی وەرگرت پێی نەگووتم برۆ بیگەڕێنەوە جێگای خۆی یان بەدوای خاوەنەکەی بگەڕێ . منیش هەستم بەخۆشی کرد کەسەیری دایکم کرد دڵی خۆشبوو. تاوای لێهات لەقوتابخانە شتم لەهاورێکانم دەبرد وەك قەڵەم وپارەو شتی تر. تاگەیشتم بەم ڕۆژە ،من تاوانبار نیم دایکم تاوانبارە ئەوسزابدەن !

ئەومنداڵە ڕاستی ووت ! بەڵێ گەورەکان بەرپرسن لەهەڵەی منداڵەکان چوونکە ئەوجیهانەی سەرەتا چاوی تیادا هەڵدەهێنی ماڵەوەیە ئەوەکەسانەی کە لێیانەوە فێردەبێت ئەندامەکانی ئەم خێزانەن_هەرکەچاوی کردەوە چی ببینی وەچیش ببیستی ئەوە فێر دەبێت. بۆنمونە ئەگەر منداڵیکت بینی لەکۆلاًن لەکاتی یاری کردندا زۆر شەڕیی نایەوە هەردەم دەم بەجوێن وهەڕەشەبوو بزانە کەلەماڵەوە ئەمە ڕەفتاریانە دەڵێن(گەورە ئاو دەرژێنێ بچوکیش خۆی پێی تەڕدەکات) وەك ئەو منداڵەی باسمان کرد کەوا لەخۆی گەورەتر تووشی ڕێگای

چەوتی کرد(دەسەلآت دارانی ئێمەش ئەم هەلآنە دەکەن )ئێستا لەکوردستانی خۆمان چەندەها بار کراوەتەوە کەوا بە جوانی وئاشکرای نوسراوە (جێگای خواردنەوە)دوور مەبینن زۆری پێی ناچی ئەگەر وابڕوات بەچاوی خۆتان و لەرێکلامەکان گوێ بیست دەبن لە کوردستانە شیرینەکەمان شوێن دەکرێتەوە بەناوی(مەلها) ،ئەوچاکەو خراپەی باسی دەکەین کێ زیاتربەرپرسیارە بێگومان ئەوەی لەتوانای دایەو لەدەستی دایە بیگۆڕی وڕێگری لێبکات. بەلآم ئەگەر ئەوەنەکات کەلەسەری واجبە بیکات ئاگاداربن ڕۆژێك دێت و تاوانی ئەم هەموو خەڵکە دەکەوێتە ئەستۆی(ابو هریرە)لەپێغەمبەر ﷺ.بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ {لەڕاستیدا پێشەوا قەڵغانە وخەڵك لەدوایەوە دەجەنگن وخۆیانی پێ دەپارێزن،جا ئەگەر فەرمانیدا بەترسان لەخوای گەورە ودادپەروەر بوو ئەوە پاداشتی خۆی هەیە. ئەگەر فەرمانی بدات بەخراپە تاوانی دەکەوێتە سەر}لەقورئانی پیرۆزیش بومان باس دەکات و دەفەرمووێ :

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيْرٌ مِّنْهَا وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٨٤﴾ صدق الله العظيم {قصص}

واتا: {ئەوەی کارو کردەوەی چاك ئەنجام بدات، ئەوە چاکتر دێتە ڕێ، ئەوەی گوناه و هەڵە بکات ، پاداشتی ئەوانەی کە گوناه و هەڵە دەکەن بە گوێرەی کارو کردەوەکانیانە}ت،ئا

## دووڕوویی ودووزمانی

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

{ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ } ﴿١٠﴾ صدق اللة العظيم {المطففين}

نیـشانەی (دووڕوو)ســێ شــتە کــاتی قــسەی کــرد درۆدەکــات.کــاتی بەڵێنیــدا نايباتەســەر. کــاتی ســپاردەی لادانــدرا خیانــەتی تيادابكــات. لەفــەرمودەكانی پێغەمبەرمانــە درودی خــوای لەســەر. درۆ ودووڕوویــی ودوزمــانی. زۆرجارلــە لەسیفەتی يەك كەس كۆدەبنەوە. سيفەتی ناشيرن وناڕێك ئاگاداربە! بەم جۆرە ئادەميزادانــە هــەڵ نەخەڵــەتيێ .ئەمانــە تــەنها بۆئــاژاوە نانــەوە ئــازان بــەلآم چارەسەريان لانيە.ئەوكەسەی كەلەگەڵت دادەنيشێت پێت هەڵدەڵێت ومدحت دەكـات هەرئـەو كەسەشـە كـەتۆی لێديارنـەبێت زەمـت دەكـات. (لايـدخل الجنـە قتـات)پێغەمبـەرمان درودی خـودای لێبـێ فەرمويـەتی :ئەوكەسـەی كـەگوێ بـۆ قسەی خەڵك هەڵدەخا وقسە دەچنی ناچێتە بەهەشت.

ئاگاداربە! زۆرن ئەوانـەی لـەخودا ناترسـن . درۆ دەكـەن دووزمـانی دەكـەن قسە هەڵدەقۆزنـەوە لەدانيشتن و مێوانـداری پاشـان دەيگێرنـەوە خۆزگـە بەڕاسـتيش بەخاوەنەكـەيان بگووتايـە نـەوەك ئەوەنـدە نيـە دووئەوەندەيـشی بۆزيـاد دەكـەن. چەند ماڵ تووشی ئاژاوەو ناخۆشی بووچەند برا وخوشك دڵييـان لـەيەك حـادز بـوو چـەند منـداڵ پەرگەنـدە بـوون چـەند هـاوڕی بـەينيان تێكـچوو چـەند مامۆستاوقوتابی توشی حادزی بوون چەند پياووئافرەت لەيەك بێشەرم بوون.

خودا بۆمان باسدەكات دەفەرموێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ ﴿١١﴾ صدق الله العظيم القلم

واتــا: {بەقــسەی ئەوانــە مەکــە چــونکە زۆرســوێند دەخۆن،بەحــەق وناحــەق، هــەروەها زۆر ســوك ورســوان} {ئەوانــەی کــە بەشــوێن عــەیب و عــاردا دەگــەڕێن ودووزمانی دەکەن وفیتنە دەگێڕن وحەزیان لە ئاشووبە}ت،ئا.

پێغەمبــەر درودی خــودای لەســەر دەفــەرموێ(ڕۆژی دووای کەســانێك دیــارن لەناوخــەڵك کەلــەدونیا دووروییــان کــردووە وەقــسەیان چــنیوە چــونکە بەدووڕوویــەوە حەشــر دەکــرین ڕوویــەکیان لەپێــشەوەیە و ڕوەکــیش لــەدواوە) ڕاستی فەرمووە پێغەمبەرمان.

درۆ چەند ڕووێکی هەیە.درۆکردن لەگەڵ ماڵ ومنداڵ. درۆکردن لەگەڵ دۆست وبرادەر. تادەگاتە درۆکردن لەگەڵ نەفسی خۆی.زۆرن ئەوانەی درۆدەکەن،یەکی کــەخاوەن خــانووە_یــان ســەیارەیە_یــان ڕێــزە دوکانــە_یــان شــوقەو خــانوی زیادهتــد..ئــەوەی کــە لەهیــچی کــەم نیــە بــەلاّم هــەردەم دەڵــێ قــەرزارم لەگــەڵ نزیکترین کەس وخزموو دۆستی،!برای ئازیز لەبەر ماڵی دونیا خۆت ڕووڕەش مەکــە لــەلای خــواو عەبــد.چــونکە ئاشــکرا دیــارە کــەوا هــەبوونی !.خــوای گــەورە پێتی داوە بەکەس لێت ناستێندرێ وەئەگــەر خــوای گــەورەش بیباتــەوە بەکــەس ڕەت نابێتەوە، ئەوەی تۆ دەیکەی هەڵەیەکی گەورەیە کەدەڵێی نیمە یان قەرزارم دڵــی ئازیزانـــت ئـــەزێت دەدەی؟دەزانـــی!خـــوای بالاّدەســـتیش لـــەخۆت دەڕەنجێنی،ئەوکات چی وەلاّمی خوا دەدەیتەوە،



## چاوبڕین بۆماڵی خەڵك

هەناسەی سارد هەڵمەکیشە کەسەیری ماڵی خەڵك دەکەیت . ئەوە تەنها ئازاردان وخەم بۆدڵت دێنی . چونکە ئەوخالقەی تۆی دروست کردوە ئەویشی دروست کردوە. ئەگەر ماڵی دابەئەو نەیدا بەتۆ مانای وانیە کەئەوی لەتۆ خۆشتر دەوێت . بەڵکو هیچ شتێك لەم جیهانە بەبێ هۆ دروست نەکراوە . بۆیی هەیە ئەو شایستەی ئەوماڵەبێ زیاتر لەتۆ چونکە ئەوەی لەتۆ دیار نیە خودا پێی دەزانێ ؟ هەرکاتێك برای موسڵمان دوعای باش و خێر بکات بۆ برای بۆهاوڕێ بۆهاوسێی بۆخزمی خودا دەفەرموێ (بۆتۆش وەك ئەو)وەهەر کاتیکیش حەسودی و وەسوەسەی شەیتان دڵی گرتی شەیتان بەنەعلەت بکە چونکە نەخێری بۆتۆ دەبێ نەئەوکەسەش خێر لەماڵەکەی دەبینێ . هیچ کات خۆت مەخەرە ناونەوچوارچێوەی کەوا بۆ؟یان بۆچی؟ ئەو هەیەتی من نیمە مەڵی من لەو زیاتر هەوڵدەدەم من لەئەو ماندووترم. ئەگەر خوای گەورە بەندەی خۆشبوێ لەم دونیا کاتیە پێی نادات هەموو خۆشیەکانی بۆهەڵدەگرێت بۆ ژیانە نەبڕاوەکەی کەدوای مردن دێت.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ۝٨

صدق الله العظيم {حج}

واتا{هەندێك لە خەڵكی هەن کەموجادەلە دەکەن دەربارەی زاتی خواو(سیفەتە پیرۆزەکانی) دوورلە هەموو زانیاری وبۆچوون وکتێب وسەرچاوەیەکی ڕوون وئاشکرا}ت،ئا.

زۆر بەداخم بۆ ئەو خەڵکانەی کەبیر لەشت دەکەنەوە لەبەر دەستیاندا نیە خاوەنی نین، هیچ کاتێکیش سوپاسی خوا ناکەن بۆ ئەوەی پێیداون وهەیانە

خۆیان خاوەنین، هەردەم سەیری دونیا دەکەن بەڕوویەکی تاریک، سەیری ناکەن بەڕوویەکی گەشبین، ئاخ وئۆف بۆ ناخۆشی هەڵدەکێشن،هەستیش بەخۆشیەکان ناکەن بۆئەوەی لە دەستیدایە تا ئەوکاتەی لەدەستی دەدات، {اعوذُ بللهٌ من نفسٌ لا تشبع} پەنادەگرم بەخوا لە نەفسێکی برسی کە تێر نابێ ، هەردەم داوای زیاتر دەکات هەرچەندە زۆریشی هەبێت داوای زیاتر دەکات،



## بەدەرخستنی نهێنی

رێك دەکەوێت کاتێك لەمیوانداریێك شتێکت بەرچاودەکەوێت . یان دەچی بۆماڵی ناسیاوێکت کەمووکوڕیەکت بینی یان هاوڕیەکت نهێنیەکت لاباس دەکات. تۆ ئەوکەسەبە کەوا پشتی پێی قایم دەکرێت؟ نهێنی پارێزبە ! ئاگاداربە. ئەگەر ئەمرۆ تۆباسی ئەوت نەکرد ئەویش ناتوانی ڕۆژێکی تر باست بکات چونکە دوور مەبینە تۆش نهێنیت دەبیٚ وپێویستت بەشاردنەوە دەبیٚ (هیچ ئادەمیزاد نیەهەڵەی نەبێت یان نهێنیٚ نەبیٚ).ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوە.ﷺ بۆمان دەگێرێتەوە دەفەرمویٚ (هەر بەندەیەك کەم وکوڕی بەندەیەکی تر داپۆشێت لەدونیادا خودای گەورە لەقیامەتدا کەموو کوڕیەکی دادەپۆشێت)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُواْ ٱلَّتِى هِىَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَـٰنَ يَنزَغُ بَيۡنَہُمۡۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَـٰنَ كَانَ لِلۡإِنسَـٰنِ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ صدق اللة العظيم الاسرا

واتا {(ئەی پێغەمبەر.ﷺ)بەبەندەکانم بڵیٚ چاکترین گوفتار بڵێن وجوانترین گوفتار(بنوسن)چونکە شەیتان بەڕاستی دەیەویٚ نێوانیان تێك بدات(هەمیشە هانیان دەدات بۆ ووتنی گوفتاری هەڵەوخراپ)،بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئاشکرای ئینسانەو(دەبیٚ وریابێت ئەودوژمنە تووشی هەڵەی نەکات)}ت،ئا.

ئەگەر دەتەویٚ دڵت ئارام بێت وبیروهۆشت مورتاح بێت ، چۆن حەز دەکەی نهێنیت پارێزراو بیٚ تۆش نهێنی پارێزبە؟ گوفتارت شیرین وڕێك بیٚ،ئەوکات خوای گەورە دڵت خۆش دەکات بەدڵنیایەوە.

ئەنەس.ڕ.خ لەسەر لەپێغەمبەر ﷺ، دەفەرمووێ(کاتی خوای گەورە دیمەنی ئادەمی کێشا لەبەهەشت. وازی لێ هێنا ئەوەندەی کە خوای گەورە ویستی،ئیبلیس بەدەوریدا دەگەڕا وسەیری دەکرد هەتا بزانێت چی یە؟کاتێك بینی ناوسکی بۆشە، زانی بەشێوەیەك دروست کراوە کە خۆی ناگرێت)



## گەورە بەسۆز سەیری بچوك بکات .بچوکیش بەڕێز گەورە ببینێ

هەوڵبدە لەمنداڵەکەت بگەیت هەوڵبدە نزیکبی لەئەو وەك هاوڕێی بە لەگەڵی . پێش گەورەبونی گەورەی مەکە ئەرکی قورسی مەخەرە سەرشان . یەکێکیان لەئەویتریان زیاترنزیك مەکەرەوە لەخۆت. برای بچووك زاڵمەکە بەسەر برا گەورەکەی تەنها لەبەر ئەوەی زیاتر خۆشت دەوێت . دەسخۆشی لەکچێکت مەکە ئەویتریان پشت گوێ بخەی لەبەرئەوەی عینادی دەکات یان ڕەفتاریت بەدڵ نیە. بۆی هەیە هەڵەی تۆبێ وادەکات . هەرلەمنداڵی ناری زیادوو خۆشەویستی زیاد منداڵ دەگۆڕێ بێ ئەوەی خۆی بیهەوێ. زۆر جار گەورەکان هەڵەکان دروست دەکەن . وەکاتێك منداڵەکان گەورەبوون ئەوکات دەیانەوێ هەڵەکان چارەسەربکەن کەواکاتی بەسەر تێپەڕیوە چارەی زەحمەت بووە ئەوکات پەنا دەبەنە بەرلێدان وحادزیی وبێ ڕێزی. ئەگەر بەسۆزنەبی لەگەڵ منداڵەکەت باوەڕبکە بێ ڕێز دەبێت ڕۆژێك لەڕۆژان بەرامبەرت. مەیەڵن بگاتە ئەوڕادەیە کەنەتوانی لەگەڵ منداڵەکەت بدوێی کەچاوی کرایەوەو تووشی هاوڕێ خراپ هات دورکەوێتەوە لەماڵ ! یان بیر لەخۆکوشتن بکاتەوە کەلەودواییانە زۆر گوێ بیستی کارەساتی دڵ تەزێن دەبین. وەدەیان هەنگاوی تری هەڵەکەدەبێتە مایەی نیگەرانی وشەرمەزاری . ئەوکاتانە ئاگاداریی بە کەمنداڵە. کەناتوانێ نهێنیت لێ بشاریتەوە وەك هاوڕێ وباوەڕپێکراوسەیرت بکات. وەك مامۆستایەکی توڕەی بێ ویژدان مەبە نەتوانی هیچت بۆ باس بکات لەترسی ئەوەی زوو هەڵبچیت و تووڕەبیت .دوایش گلەیی لێمەکە کەنەیتوانی هەموو وردەکاریەکت بۆباس بکات کەتووشی دێت چونکە تۆدەناسێ کەئەوکەسەنیت پشییت فراوان بێ ودڵت گەورەبێت کەبتوانی دڵی بۆ بکەیتەوە ئەویش بتوانی نهێنیەکانی باس بکات بۆت. دڵنیابێ کەوا تۆ ئەوکەسەی کە خەمەکانی لەگەڵ هەڵدەگری وچارەسەری بۆدەدۆزیەوە و هەردەم جێگای

متمانەی(بۆلەبازار لە شەقام لە کۆرو کۆبونەوەکان لە خوێندنگا لەماڵی هاوڕی وناسیاو ڕێز لەیەکتری دەگرن .بە بەڵێ .بەفەرموو. بەدەست خۆشی هتد..قسە لەگەڵ خەڵك دەکەن چونکە دەزانن کارێك و ڕەوشتێکی جوانە. ئەی بۆ لەناو خێزانــدا ئــەم جــۆرە ڕەفتارانــە بــەکار نــاهێنن بۆ؟لەبەرچــی؟)دووبــارە دەڵــێم وداوادەکەم بەڵکوتکا دەکەم بەسۆزبن . تا هەردەم بەهێزبن وەبەڕێزبن لەلای منداڵەکانت کەنەوەی دواڕۆژن.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿٢١﴾ صدق اللة العظيم {الانفال}

واتا {هەرگیز وەك ئەوکەسانە مەبن کە(بەدەم دەڵێن)،تێ گەیشتین، گوێ ڕایەڵین، (کەچی هەروەك)ئەوەی کەنەبیستن وتێ نەگەن وایە}ت،ئا.



## پاراستنی ئابروو ناموسی خەڵك

ئەم رەفتارە ناشیرینە لەلای ئیمەی کوردی موسڵمان نەبوو . سەیر کردن وتێڕوانین وتەئمین نەبون دڵنیانەبووە لەماڵ ومنداڵ .هەمووی بەدیاری بۆمان هات لەدەرەوە. لەلایەن تەلەفزیۆن وسەتەلایت وئەنتەرنێت وخارجیەکان . لەیادمانە کەباپیرانمان دەیانگوت هاوسێت ناموستە بیپارێزە پارێزراوی دونیاو قیامەت دەبی لەگەڵ دۆست وبرادەرو خزم وهتد..؟باوك بەکوڕی دەگوت:کوڕم بەرد مەهاوێژە بۆماڵی خەڵك چونکە ماڵی تۆش پەنجەرەی تیدایە ؟کوڕم کەس عەیب دار مەکە بەسەیر کردن وقسەکردن چونکە دورنیە تۆش ڕۆژێك بەسەرت بێت.

ئازیزم؟هاوڕێی خوێندنت بپارێزە ئاگاداربیە ئەوکات هەست بەئارامی دەکەی چونکە دڵنیا دەبیٚ کەخودای گەورە چۆن تۆی والێکردوە ئاگاداری ئەوبی یەکێکی تردەنێرێت تائاگای لە خوشکی تۆبیٚ . دڵت پاك بکەوە لەهەموو نیەتێکی خراپ بڕوات هەبیٚ کەس ناتوانیٚ خراپە بکات بەرامبەرت. ببە بەنمونەیەکی سەرنج ڕاکیش بۆچواردەورت تۆ ئەوکەسەبە کە دەست پێشخەری دەکەی لەکاری باش وچاك. پێغەمبەرمان درودی خودای لەسەر فەرمویەتی(هەرکەسی لەناموسی برایەکی پشتگیری بکات .خودا لەڕۆژی دوایی ئاگر لەڕووی دووردەخاتەوە)ئیمامی ترمزی وحسن.ریوایەتیان کردووە.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًا أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾ صدق الله العظيم { يونس}

واتا {ئەوانەش کەگوناهو تاوانیان ئەنجام داوە(هەرچەندە)پاداشتی هەر گوناه و تاوانێك بەقەد خۆی دەدرێتەوە(بەلاّم هەندێك ئەوەندە تاوانبارن)خەجاڵەتیی وسەرشۆڕی وڕووڕەشی ماندووی کردوون،کەس نیەپەنایان بدات(لەخەشم وقینی) خوا، ئەوەندە رووڕەشن هەردەڵێی پارچەیەك لە شەوی تاریك ڕوخساری داپۆشیون، ئائەوانە نیشتەجێی ناوئاگری دۆزەخن وەبۆهەمیشە ژیان لەناویدا دەبەنەسەر}ت،ئا.

ئەبوهوریرە ڕ.خ لەسەر ، لەپێغەمبەر.ﷺ،لەسەربێت بۆمان دەگێڕێتەوە دەفەرموێ (حەسودی بەیەکتر مەبەن. زەم بەسەر یەکترمەکەن، ڕقتان لەیەکتر نەبێتەوە، پشت لەیەکتری مەکەن، بەندەیەکی ڕاست ودروستی خوابن ، وەك برابن،موسڵمان برای موسڵمانە ستەمی لێناکات، پشتی بەرنادات، بەسووك سەیری ناکات، لەخوا ترسان لێرەدایە، پێغەمبەر ﷺ،سێ جار ئامارەی کرد بۆسینگی(بەسە بۆخراپ بوونی مرۆڤێك، کە بەسووك سەیری برا موسڵمانەکەی بکات، هەموو شتێکی موسڵمان لەسەر موسڵمان حەرام وقەدەغەیە، خوێنی ومالّی وناموسی))



## ڕاستی و ڕاست گوۆیی.

لەم سەردەمەی ئێستامان ڕاستی وڕاست گوۆیی کەم بووە. زۆران هەن تەنها بۆئەوەی خۆیان بگونجێنن لەگەڵ دەورووبەر پەنادەبەنە بەر درۆکردن . زۆر بەپەرۆشەوە دەڵێم؟ ڕازی دەبی ئەگەر یەکێك بۆئەوەی خۆی لەلات خۆشەویست بکا درۆت لەگەڵدابکا. هەردەم قسەی ڕاست وکرداری دروستت هەبێ . چونکە درۆ نەخۆشیە ! هەرکەسێك تووش بێ زۆر بەزەحمەت ڕزگاری دەبێ.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٣﴾ صدق الله العظيم { الصف }

واتا {ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك دەڵێن وئەنجامی نادەن؟بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە} {گوناهێکی گەورە وهەڵەیەکی مەزنە لای خوا ئەگەر شتێك بڵێن وجۆرێکی تر ڕەفتار بکەن}ت،ئا.

ڕۆژێك پیاوێك دەچێ بۆ سەردانی مامۆستایەکی ئایینی . دوای دانیشتن چاو دەگێڕی لەژوورەکە دەڵێ : مامۆستا چۆنە ژوورەکەی جەنابت تەلەفزیۆنی تیانیە؟ ئەویش دەڵێ حەزی پێ ناکەم وەنامەوێت بیهێنم بۆماڵەکەم . باهەردەم ماڵەکەم پڕلەمەلایکەت بێ بەهەبوونی قورئان و زیکر کردن . من چۆن شەیتان دێنم بەدەستی خۆم لەماڵەکەم دایدەنێم کاکەگیان تەلەفزیۆن شەیتانە. پیاوەکە ووتی مامۆستا تەلەفزیۆن باشە بۆهەواڵ زانیین ودەنگ وباسی جیهان . مامۆستاکە ووتی پێویستم پێی نیە لە ڕادیوو گوێ بیستی هەواڵەکان دەبم. ئەویش گووتی بەخوا منیش حەزی پێناکەم بەلاّم هەر وەك دیکۆر لەماڵەکەم دامناوە تەنها نەڵێن بۆتەلەفزیۆنتان نیە نەوەك سەیری ناکەین منیش وەك تۆ

بەحەرامی دەزانم هەرنامەویٚ لەماڵبیٚ بەڵام جار جار منداڵەکان سەیری (ئەفلام کارتۆن دەکەن)دوای ماوەیەك دانیشتن خواحافیزی کردوو ڕۆیشت

لەڕێگا تووشی هاوڕێیەکی بوو. دوای سلاّووسەلام زۆر تەکلیفی کرد .هەردەبیٚ بچین بۆماڵمان زۆرنزیکە لێرەوە . هەرچۆنێك بیٚ لەگەڵ خۆیدا بردیەوە. ئەوپیاوە کەوا ماوەیەك پێش ئێستا لەماڵی مامۆستا ئاینیەکەبوو خۆی لەشوێنێکی ترو ماڵێکی تر دۆزیەوە . سەیری کرد هاوڕیٚ یەکەی کۆنترۆلی سەتەلایتی بەدەست گرتووەو کەناڵە ئەورووپیوو ئەجنەبیەکان دەگۆڕیٚ. لەوکاتە گووتی ؟ ئەم سەتەلایتە کەناڵی زۆردەگوازێتەوە چ مارکەیەکە؟ لەکویٚ کڕیوتە؟ من تائێستا نەمکڕیوە لەجۆرێکی باش دەگەڕێم بۆئەوەی هەر جارەو بابەتێکی تر دێت ئەوەی پێشوو پشت گویٚ دەخریٚ . هاوڕێیەکەی گووتی: تۆ لەکویٚ دەژیی ئەوە چۆن قسەیەکە دەیکەی ئێستا هیچ ماڵێك ماوە سەتەلایتی نەبیٚ دیارە تۆ زۆر کۆنەپەرستی. ووتی کۆنە پەرستی چی ؟ ئێستا لەماڵی یەکێك بووم کەمێك دەمناسی ئەوکۆنەپەرست بوو تەنها تەلەفزیۆنیشی لەماڵ دانەنابوو دەیگووت گوناهە . توخوا ئەم قسانەباویان ماوە . ئەگەر من تائێستا سەتەلایتم نەکڕیوە لەبەر ئەوەبوە کاتم نەبووە نەوەك زۆرلەمێژەوە کڕیبووم .

سەیرکەن دونیا چەند سەیرە مرۆڤی نەزان تەنها خۆی دەگونجێنی هەرچۆنێك بیٚ گرنگ نیە ئەگەر درۆش بکات تەنها خۆی دیاربخات.ئەی ئەوەی درۆ لەگەڵ خواش دەکات،ئێمەی ئادەمیزاد چی ببینین باوەڕی پێدەکەین ، چۆن مرۆڤ شەرم ناکات لەگەڵ خودادرۆ دەکات ئەوەی ئەوجۆرە ڕەفتارانەی هەبیٚ لەگەڵ تۆ دەبیٚ چۆنبیٚ، کەیەکێك دەچی بۆماڵی یان دێت بۆماڵت سەیر دەکەی لەبەر شەرمی تۆ دەچیٚ دەسنوێژ هەڵدەگریٚ گوایە نوێژ دەکات کەتۆ باشیش دەزانی نوێژ ناکات یان مانگی ڕەمەزانە کەتۆ دەبینیٚ دەڵی بەڕۆژووم ئەوانە چۆن

وەلأمی خۆیان دەدەنەوە لەبەرامبەر خالقیان کەدروستی کردوون ودەزانی چۆنن وەچیانکردوە لەژیانیان.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿١٠﴾ صدق الله العظيم {البقرة}

واتا: {ئەرانەی لە دلْ ودەرونیاندا دەردوو نەخۆشی(حەسودی و کینە ورِق لەموسلْمانان) هەیە،خوایش(بەسەرخستنی حەق وئیمانداران)ئەوەندەی تر دەردیان کاریگەر دەکات وسزایەکی سەختیش (لەدنیا وقیامەتدا)چاوەڕییانە بەهۆی درۆکردن و(دژایەتیان بۆ ئیسلام}ت،ئا.



## چاكە وخراپە

هەندێ جار چاكە كردن لەگەڵ هاورێ وناسیاو .هتد_بەخراپە لەسەرت دەوەستێ . زۆرجار وامان لێدێت كەچاكە نەكەین . زۆركەس مانای چاكە نازانی وەك قازانجێك ومصلەحەتێك سەیری دەكات . ئەگەر هەریەكەو لەلای خۆی گووتی من عیلاقەم چیە ئایا كارەكە باش دەبێ؟ برایەك هەستا چاكەیەكی كرد لەگەڵ برا بچوكەكەی ، ژنێكی بۆ دەست نیشان كرد كەگوایە بنەماڵیەكی باشن ، هەردوو بنەماڵە یەكتریان بینی هەروەها كورەكەوكچەكەش، رایان لەیەكتر بوو ، بەخۆشی هەردوولا ئاهەنگیان گێرا بووك وزاوا بەیەك شادبوون ، ماوەیەكی پێچوو بووبە هەراو ناكۆكی لەهەردوو لاوە لۆمەی ئەودیان دەكرد كەبەیەكی گەیاندن، ماوەیەكی تری پێدەچوو بەینیان باشدەبوو شەروهەرایان نەدەما تەنها جارێك نەیان دەگووت خوا خێرت بنوسی كارێكی باشت كرد، ئەوە بوو حاڵیان هەردەم ئەگەر موشكیلەیان هەبوایە ئەوكەسەیان بەبیر دەهاتەوە ،ئەگەر لەخۆشیش دابونایە بەخەیاڵیشیان دانەدەهات، چەند ماڵی باوكی كچە خراپیەكەیان دەداپاڵی دووئەوەندەش ماڵی باوكی خۆی دەیانگووت ئەوە چۆن ژنێك بوو بۆ براكەت دۆزیتەوە، تاوای لێهاتبوو لەهەمویان بێزارببوو دەیگووت ئەگەر حاڵ وابروات هیچ رێگای ترم بەدەستەوە نیە تەنها جیابونەوەیان لەیەكتری ،هەرچەند ببوون بەخاوەن منداڵ وماڵی سەربەخۆ بەلآم بەردەوام بوون لەسەر ناكۆكی، منیش دەڵێم ئەقل بۆمرۆڤ باشترین سەرمایەیە كەبەپارە ناكرێ:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعۡمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ أَعۡمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلٗا ﴿٧٢﴾

صدق الله العظيم { اسرا }

واتا {جائەوەی لەم دونیایە (دڵ ودەروون وبیرو هۆشی)كوێربێ، لەقیامەتدا (چاویشی ) كوێرە، وەزۆر سەرگەردانترو سەرلێشیواوترە}ت،ئا.



## کێ شایستەیە زیاتر لێی بترسیی

دزیەك کرا لەماڵێك :هاوسێ یەکیان هاتەلای ماڵ دزراوەکەو گووتی من گوناهم دەگات ئەگەر ئەوەی دەیزانم پێتی نەڵێم، ووتی من دیتم فلاّن کەس لەفڵان کات لەدەرگای بەیتونەکەی ماڵتان چووە خوارەوە من هەرئەوەندەم دیت بەلاّم شایەدی نادەم کەئەو دزیەکەی کردوە ، ئەویش خەبەری لێدا،دوای گرتن و لێدان هیچ دانی پێدانەنا کەدزیەکەی کردوە تاگەیشتە سوێند خواردن، سوێندی خوارد کەئەونەچۆتە ماڵیان ودزی نەکردوە، هیچی لەسەر ئیسپات نەبوو بۆیە بەریان دا . ماڵدزراو هەر شکی لێبوو بەلاّم نەیدەزانی چیبکات تا ڕۆژیك هاوڕیەکی گووتی لەگەڵم وەرە دەچین بۆلای (..)کەسێکی دیاروو کاربەدەست بوو . چوونە لای ئەویش گووتی ئەوە هەر موشکیلە نیە من چارەی دەکەم خەمتان نەبێ، ڕۆژێکی پێچوو لەدەرگا درا ئەویش دەرگای کردەوە چیدەبینیٚ؟ ئەوکەسەیە کەشکی هەبوو دزیەکەی لێکردوە ، هاتوە دەڵی من بووم دزیەکەم لەماڵی ئێوە کرد بمبورە ئەوەش پارەکەتانە بۆم هێناٚیتەوە زوو بتگووتایە من فلاّن کەس دەناسم ئەوها ڕووی نەدەدا، بەیانیش ماڵم باردەکەم لەم گەڕەکە دەڕۆم ،

لەخودا. لەقورئان. لەویژدانی. نەترسا لەمرۆڤێکی دەسەلاّت دار ترسا ، ئایە کامەیان باشتربوو لێی بترسایە .(دوای چەند مانگێك لەسوێند خواردنی بەدرۆ ئەو دەستەی کەلەسەر قورئان داینابوو بڕایەوە بەهۆی کارەساتێك)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾ صدق الله العظيم {زومر}

واتــا {(ئەوانــــە)قـــەدری ڕێـــزی خوایـــان وەك پێویـــست نـــەگرت، ڕێزیـــان بۆدانەنا،بەمـەرجێك هـەر هـەموو گـۆی زەوی پـڕ مێـشکی ئـەو زاتەیـەو لـەڕۆژی قیامەتــدا(لەژێردەســـەلأتی ئەودایـــە) ئاسمانەکانیــشی لــەژێربالّی قودرەتیــدا پێـچراوەتەوە (ئامـاژەیـە بۆنیـشانەی دەسـەلأتی بـیٚ سـنووری ئەوزاتـە) پـاکیی وبێگەردیی وبلّنـدیی بۆئـەو پـەروەردگارە مەزنـەی شایستەی ئـەوە ذیـە نـەفامان هاوەلّی بۆ بڕیار بدەن و(قەدری نەزانن).}ت،ئا.

ئەبو زەری غەفاری، لەپێغەمبەر دەگێڕێتەوە د،خ لەسەر دەلّـیٚ ئامۆژگـاری کـردم وفەرمووی،هەرکاتێك شۆربایەکت لێنائاوی زیاتری تێبکە،پاشان ورد بەرەوە لە مالّەکانی ،راوسێت بەشیان بنێرە بەچاکە،

خۆشەویستمان فـەرموی بەشـیان بدەن لەخواردنەکـەی دەیخۆن، نـەوەك تـەئمین نــەبن نــەتوانن مالّیــان چــۆلّ بکــەن دزیــان لێبکرێــت،(وایــە جیرانــەتی)وەك خۆشەویستمان فەرموویەتی.



## نیەتی باش ونیەتی خراپ

پیاوێك ئەگەڵ خێزانەکەی چوون بۆبازاڕ بۆشت کڕین وپیاسە. تەمەنیان لە۲۷_تا۳۲ ساڵی دەبوو ، دەڕۆیشتن لەبازاڕ کاتێك کچێکی زۆرجوان بەرامبەریان دەهات پیاوەکە سەیری کردو زەردەخەنەیەکی لەسەر لێوان بۆدروست بوو، کەمێکی تر ڕۆیشتن ئەوجارە کوڕێکی گەنجی بالاَبەرزی ڕێك بەرامبەریان هات، ئەمجارە خێزانی پیاوەکە سەیرێکی کردوو قسەیەکی کرد کە پیاوەکەی گوێ لینەبوو تەنها زانی دەنگی هات. زۆر بەتوڕەیی بەژنەکەی گووت بابچینەوە بۆماڵ؟ ئەویش گووتی شت ماوە بیکڕین چۆن بچینەوە . پیاوەکە ووتی : کوڕەکەمان لای دایکم جێهێشتوە نەوەك بگرێی دوایی بەئەو گیرنابێتەوە.

کەچوونەوە هەر توڕە دیار بوو قسەی لەگەڵ نەدەکرا. خێزانەکەی پرسی تۆچیتە بۆئاوا بەجارێك هەڵسوکەوتت تێکچوو خوانەخواستە نەخۆش نیت؟ بەژنەکەی گووت پرسیارێکت لێدەکەم سوێندت دەدەم بەڕاستی ولاَمم بدەیتەوە. ئەویش سوێندی بۆخوارد کە بەڕاست ودروستی ولاَمی بداتەوە وەگووتی من لەژیانم درۆم نەکردوە، پیاوەکەی گووتی کەلەبازار بووین کاتێك ئەوگەنجە بەرامبەرمان هات دەتناسی ؟ قسەیەکیشت کرد چیت ووت؟ خێزانەکەی پێکەنی ووتی ئەم گەنجە ناناسم بەلاَم لەناخەوەم دیت زۆر دڵ گەورەو باش دیاربوو ئاکاریشی زۆر ڕێك وجوان بوو بۆیە دوعام کرد کەخودای گەورە کوڕەکەمان وەك ئەوگەنجە ئاکاروڕەوشت جوان بکات وەدوعاشم بۆگەنجەکە کرد کەخودا چۆن خولقەتێکی جوانی پێبەخشیوە ئەخلاقی جوانتری پێببەخشێ. بۆچیبووە؟ ئەویش داوای لێبووردنی کرد چونکە بەجۆرێکی تر لەڕوداوەکە گەیشتبوو . بەخێزانەکەی گووت تۆ باشترو چاکترو ئاقلتری لەمن . ئەویش ووتی بۆ وادەڵێی ؟ گووتی بامنیش پێت بڵێم ئەوکاتەی لەبازاڕ بوین کەکچە جوانەکە بەرامبەرمان هات من بۆ پێکەنیم. لەدڵم گووتم

ئەمە چەندەجوانە ئەی بۆ ژنێكم نەهێنا وەك ئەمە جوانبێ . من شەرمەزارم نەمزانی جوانی تەنها جوانی دڵ ورەوشت ونیەتی مرۆڤە !جوانی روخسار هیچ مانایەكی نیە بەرامبەر دەروون ودڵ

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ عَـٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَـٰدَةِ هُوَ ٱلرَّحْمَـٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ صدق الله العظيم {حشر}

واتا: {خوا ئەوزاتەیە كەجگە لەو خوایەكی تر نیە زانای نهێنی و ئاشكرایە ئەو خوایە بەخشندەو میهرەبان ودلۆڤانە(كانگای رەحم وبەزەییە)ت،ئا .

پرسیاریك ئازیزم؟تۆ چۆن نیەتێكت هەیە بەرامبەر پەروەردگارت، تاچەند خۆشت دەوێت؟ تاچەند دەترسی؟ تاچەند بە ووتەو باسی ناحەق بەرامبەر بەئەو بەجوابی؟ ڕۆژێك لەبازار دووكەس بوو بە دەمەقاڵیان لەسەر شتێكی بچووك، یەكیكیان جوێنیدا گووتی: دایكت واو خوشكت وا، ئەرەی تریان خوێن بەری چاوی گرت كەوتەسەر كابرا زۆری لێدا و بەوەش نەوەستا هەزار جوێنی ناشیرینی پێداوە، لەو بەسەرهاتە پرسیارێكم بۆدروست بوو؟ ئەگەر ڕۆژێك هەرئەوكەسەتووشی قسەیەكی ناشایستەهات بەرامبەربەخوای گەورە كوفری كرا(نعوذوبللە)چ هەڵوێستێكی دەبوو چۆن وەڵامی دەدایەوەو چی لەگەڵ دەكرد؟ ئایا هەر وادەبوو یان زیاتر توڕە دەبوو یان ڕووی خۆی وەردەگێڕاو دەیگووت چ عیلاقەم هەیە ئەوە بەمن چاك نابێ! ئایا دایك وخوشكی یان خێزان و كچی نزیكترن بۆی لەخوای گەورە؟

ونحن اقرب اليه من حبل الوريد

خوای گەورە ئەوەندە ئادەمیزادی لەلا گرنگە و خۆشەویستە، كەچی ئەویش ئاوایە بەرامبەری!

## ڕەوشت جوانی

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَإِذَا سَمِعُواْ ٱللَّغْوَ أَعْرَضُواْ عَنْهُ وَقَالُواْ لَنَآ أَعْمَٰلُنَا وَلَكُمْ أَعْمَٰلُكُمْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٥٥﴾ صدق الله العظيم {قصص}

واتا {ئەوانە کاتێ کەقسەو گوفتاری نابەجێ دەبیستن پشتی تێ دەکەن ودەڵێن (بەنـەفامان)کـارو کـردەوەی خۆمـان بۆخۆمـان، سـڵاوتان لێبێـت (ئێمـە شەڕخوازین)ئێمە بەتەمانیین کە لەگەڵ نەفاماندا(دانیشین).}ت،ئا.

ڕەوشتی جوان بۆئادەمیزاد باشترین سەرمایە.کەناتوانی ئادەمیزاد بەدەستی بهێنێ بەهەوڵدان وتیکۆشان. ئـەبوهورەیرە بۆمـان دەگێڕێتـەوە لەپێغەمبـەری خۆشەویست درودی خوای لەسەر دەفـەرمووێ (ئەگەرخوای گـەورە بەندەیـەکی خۆشویـست ئـەوا بـانگی جبرائیـل دەکـات وپێـی دەفـەرموێ.مـن فـلاَن کەسـم خۆشـدەوێت ،تـۆش خۆشـت بوێت،ئـەوکات جبرائیـل خۆشـی دەوێت،پاشـان لەئاسمانـەکان جاردەدەن خـودای گـەورە فـلاَن کەسـی خـۆش دەوێـت ئێـوەش خۆشـتان بوێت.ئـەوەی لەئاسمانەکانـە هـەموویان خۆشـیان دەوێت.دوای ئـەوە لەزەویشدا پەسند دەکرێت) واتـە لـەناو خەڵکدا خۆشـە ویست دەبێ. ئـەوەش لەخۆیەوە ڕونادات . بەڵکو ڕەوشت و کرداری ئەو مرۆڤە وا دەکات ئەو پلەییەی پێ بدرێت.

لەحەدیسێکی تر دەفەرموی(خودای گەورە نەرمو نیانە. نەرموونیانیشی خۆش دەوێ)صحیح مسلم.

لەحەدیـسێکی تـر دەفـەرموێ(پاڵـەوان کێیـە لـەناو ئیـوەدا؟ هـاوەڵان فـەرمویان ئەوکەسەیە کەنەتوانن بیدەن بەزەویدا،

فـەرمووی، پاڵـەوان ئـەوە نیـە . بـەڵکو ئەوکەسـەیە کەلـەکاتی توڕەییـدا خـۆی دەگرێـت) . ئـەو باسـانە بۆمـان ڕوون دەکاتـەوە کـەئادەمیزادی ڕەوشـت جـوان چۆنە وکێیە.

## ڕژدبوونە لەسەر قسەوباس

هەروامەزانـــە كەتۆهەڵــە ناكــەی،هیچ كــەس نیـــە هەڵـــەوتاوانی نـــەبیٚ ئێمــە ئادەمیزادین (فریشتە) نین، سورمەبە لەسەر ووتنی ووشەی (من)چونكە هەردەم تـۆ ڕاسـت نیـت وبەرامبەرەكـەت هەڵـەبێت، هـەردەم بەرامبەرهەڵـەو تـاوان ببـەوە ؟سورمەبە لەسەر قسەی خۆت دان بەهەڵەكانت دابنیٚ. شـەرم نیە یـەكێك هەڵـەی خۆی ڕاست بكاتەوە . شـەرم ئەوەیە هەڵـە دووبـارە بێتـەوە، ڕق وكین لەكەسێك هەڵمـەگرە ئەگـەر ووتـی ئـەو كـەموو كوڕیـەت هەیـە یـان ئـەو هەڵەیـەت هەیـە. ئەوكەسە دڵسۆزە كەدەت گرێنێت ، نەوەك ئـەوەی وادەكات هـەردەم ددانـەكانت دیاربن چونكە لەشكستی تۆدایە. تۆش ڕژدمەبە هیچ كـات لەسـەر قسـەت تـەنها بۆكـاری چـاكەو خێـر نـەبیٚ، زۆرسـەیرە ئـادەمیزاد حـەزدەكات خـەڵك چـاكەی لەگەڵـدابكات بـەڵام خـۆی نایكات،حـەزدەكات قـەرز وەرگرێـت بـەڵام بـەخۆی نایدات،حەزدەكات منەت لەسەر خەڵك بكات بەڵام بەخۆی قبوڵی ناكات كەسیٚ منـەتی لەسـەر بكـات، هەسـت بكـە بەهەڵـەكانت، تاهەسـت بەخـەڵك بكـەیت،خۆۆ ویست مەبە،

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَٰدِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾ صدق اللة العظيم { النحل}

واتا: {ڕۆژێـك دێـت كەهـەموو كـەس(خـەمی خۆیـەتی)بـەرگری لـەخۆی دەكـات، پاكانە بۆخۆی دەكـات،(گـویٚ بەكەسـی تـر نادات،ئـەو ڕۆژە)هـەر كـەس پاداشـتی كردەوەكانی دەدرێتەوە ئەو(خەڵكە)ستەمیان لیٚ ناكرێت.}ت،ئا.

هـیچ كـات خـوای گەورەسـتەمی لەبونەوەرودروسـت كـراوی خـۆی نـەكردووە وستەمیـــشی لێناكات،بـــەڵام ئـــادەمیزاد بـــەخۆی ســـتەم لـــەخۆی دەكـــات

ولەچواردەوریشی هەروا،بەردەوام ڕۆژ مەبە لەسەر قسەی خۆت کە دەزانی ڕاست نیە ورەوا نیە ئەوەی، (پیاوێك قسەی خۆشی نەدەکرد لەگەڵ خەسوو خەزوری وکەیفی پێیان نەدەهات ، لەبەر ئەوەنەبێ قسەیەکی ناشیرن ونابەجێیان پێگوتبێ ، تەنها لەبەر ئەوە خێزانەکەی حەزی دەکرد زوو زوو سەردانیان بکات کەوا هەردوکیان نەخۆش بوون، لەگەڵی دەچوو تادەیگەیاندە دەرگایماڵیان بەلاّم نەدەچوو بۆ ژوور سلاّویان لێبکات وله ئەحواڵیان بپرسی، کاتێکی زۆر وایان دەگوزەراند، خێزانەکەی دەنگی نەدەکرد چونکە حەزی نەدەکرد دڵ حادزی پەیدا بێت لەبەینیان هەرجارەو درۆیەکی بۆ دەدۆزیەوە ، دەیگوت خوایە لێم خۆشبە ناچارم دڵی ئەوان ڕازی بکەم ودرۆی مەصلەحەت بکەم،تاڕۆژێکیان هات بەدوای خێزانەکەی بیباتەوە کەلەماڵی باوکی بوو، لەبەر دەرگا بانگی کرد زووکە بابڕۆین؟ خێزانەکەی گووتی ماڵی خاڵم لێرەن کەمێك وەرە ژوور سەلام بکە تامناڵەکان حازردەکەم ؟ ئەویش گوتی نایەم پاشان من سەلام بکەم ونەیکەم هیچ ناگۆڕی زووکە بابڕۆین! لەم سەین وبەینە دایکی خێزانەکەی هاتە دەرەوە گووتی کوڕم بۆنایەیتە ژوور نان حازرە ،وەرە دانیشە بەینیکە نەمان بینیوی براکەشم لێرەیە وەرە نانەکە بخۆن ئینجا بڕۆن؟ بەلاّم ئەو هەر لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو، خێزانەکەی لەدڵی خۆیدا دەیگووت بۆچی ئەگەر جارێك بەجوانی قسە لەگەڵ خزمی ئەونەکەم یان بچێت بۆسەردانیان من حەزنەکەم بچم ئەگەر نەخۆشیش بم وەنەتوانم .ئەوردەڵێ کەیفت بەخزم وکەسی من نایەت ؟ئەی بۆچی من هەموو جۆرە دڵ شکان وقسەیەکی لێ قبوڵدەکەم ئەوتەنها چاك وچۆنی لەگەڵ خزم وکەسی من ناکات تائێستاش قسەیەکی ناشیرنیان پێنەگووتوە، باشە ئەگەر وەك خەڵکی تر خزمەتی کردبونایە ئەرکی هەڵبگرتنایە چیی،

لەبەر ئەوە گووتی تۆنەتوانی سەلام بکەی منیش نایەمەوە لەگەڵت. ئەوەبوە هۆی دڵ عادزی هەردوولا، بۆ وای لێهات سەبەب چیبوو تەنها ووەسوەسەی شەیتانە و ڕژدبوونە لەسەر قسە ئەگەر هەڵەش بێت.



## بێ ئومێدبوون لەڕەحمەت وبەخشندەی خوا

هیچ کات ناهومێد مەبەئەگەر ئیمانێکی جێگیر ونەگۆڕت هەیە، کەبەهیچ جۆرە تاقی کرا نەوەیەك جێگای بەر نادات چوونکە بەڕاستی پتەوە، سەیری ئاسمانت کردوە کاتی هەوری ڕەش ڕووناکی ڕۆژ بزر دەکات،.سەیرت کردوە کاتی ناخۆشی و نەخۆشیەك ڕوو لەماڵەکەت دەکات، ئەی کاتی بەهۆی زەرەرێك دڵت خەموو خەفەت داگیری دەکات،وادەزانی جارێکی تر ڕووناکی ڕۆژوو خۆشی نابینیتەوە.

ئەی کاتی ئەومنداڵەی کەخۆت گەورەت کردوە بەبێ شەرمی قسەت لەگەڵ دەکات،

زۆرن ئەوانەی دڵی ئادەمیزاد سەخڵەت دەکات، بەڵام ئەوانە هەمووی کاتیە ڕووت تێدەکات تەنها لەسەرتۆ ئەوە پێویستە لەکاتی نائومێدبوون لەهەر شتێ داوای یارمەتی لەخوای گەورە بکەیت، هەرتەنها ئەوبوو نوحی(علیە سلام) رزگار کردلە تۆفان، ئەوبوو بەهانای نەبی یونس(علیەسلام)هات لەناو زگی نەهەنگ، ئەوبوو یوسفی(علیەسلام) رزگار کرد لەناو بیر کاتێ براکانی فڕێاندا ناوی، هەر خوای گەورەبوو پێغەمبەرمانی (ﷺ)ئاگادارکردەوە لەفێڵی بێباوەڕەکان، هەر ئەویش بوو ئێمەی میللەتی کوردی ڕزگار کرد لەدەستی صدامی زاڵم، تەنها هەر خوای گەورەیە ئاگادارە بەهەموو خراپەیەك کەڕوو لەئادەمیزاد دەکات، هەرخۆشی خاوەن دەسەلاتە کەنەهامەتیەکان و ناخۆشیەکانی لەسەر لاببات؟ ئەوکاتەی نائومێد بووی ودڵت تەنگ بوو کاتێك زەرەرت کرد، کاتێك منداڵەکەت کەوت لەدەرسەکانی، کاتێك کەسێکی ئازیزت لەدەستدا، وەبۆ هەرشتێکی تر کەڕوودەدات ئایا هیچت کرد، تەنها بیر کردنەوەو دڵ سەخڵەتی ونائومێد بوون نەبێ، بەم هەموو بیرکردنەوە هیچت جێ بەجێ کرد ناخۆشیەکانت چارە سەرکرد خەمەکانت ڕەواندەوە بێگومان نەخێر، هەروەك ووتمان چارە تەنها لای خوای گەورەیە، پێت شکستی ودڵ

شکان نیە کەوا دەچیتە بەر دەرگای ناسیاوێکت یان هاورێ یەکت داوای یارمەتی دەکەیت وئەگەر دڵیشی بێت ئەوەی داوات کردووە پیت بدات، وەئەگەر یارمەتیشی نەدایت وهاوکاری نەکردی چەندەها عوزرت بۆ دێنێتەوە، تۆش باوەڕ دەکەیت وبەنائومێدی دەگەڕێیتەوە، دووبارەوسێ بارەی دەکەیتەوە لەگەڵ خزمی ترت، بەڵام تەنهاجارێك کرنۆش نابەیت و ناپاڕێتەوە لە پەروەردگارت هاوکاریت بکات ؟ئایا کامەیانت پێ باشترە (ئەوەی نهێنیت دەپارێزێ یا ئەوەی لەناو خەڵك ڕسوات دەکات) وهەردەم بەڕووت دادەداتەوە کە داوای یارمەتیت لێی کردوە:

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَلَوْ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسْتِعْجَالَهُم بِٱلْخَيْرِ لَقُضِىَ إِلَيْهِمْ أَجَلُهُمْ ۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١﴾ صدق الله العظيم {يونس}

واتا {ئەگەر خوا بە پەلە خەڵکی تووشی شەڕو ناخۆشیی بکات(لەسەر داخوازی خۆیان کاتێ کەتەنگە تاودەبن)هەروەك وچۆن بۆ داخوازیی خێر پەلەیانە، هەرهەمووان کۆتایی بەژیانیان دەهات (بەڵام خوای گەورە واناکات، بەڵکو دەفەرموێت): ئەوانەی کە نایانەوێت ئێمە ببیننەوە وباوەڕیان پێی نیە، ماوەیەك وازیان لێ دێنین تا لە ستەمیاندا ڕووبچن}ت،ئا.



## گولْ بریتیە لەچی

بۆی هەیە بلێن ئەوەش بۆتە پرسیار، هەمووومان دەزانین پێك هاتەی گولْ(ڕەگ وقەدو گەڵاو گوڵە)بەڵام شتێکمان بیر چوو بڵێن قەدو گەڵای پارێزراوە بە(دڕك)، زۆرجار گویْ بیستی ئەوەدەبین کەوا فلان کەس هەرچەند بیْ باوەڕە یان نوێژ ناکات یان تاوان وگوناه ئەنجام دەدات بەڵام خوای گەورە رزق و ڕۆزی پێدەدات بەڵکو بەفراوانیش، بۆچی؟ لەبەرچی؟ هەندیْ جار لەبەر بیر کردنەوەی قول وشەیتانی توشی غەیبەت وگوناه دێن،

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ ٱلْقُرُونِ مِنۢ بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿١٧﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْءَاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾ صدق الله العظيم {الاسرا }

واتا {چەندەها نەوەمان لەدوای نوح لەناو بردووە، ئەوەندەش بەسە بۆ پەروەردگاری تۆ کە ئاگادارو بینایە بە گوناهو تاوانی بەندەکانی} {ئەوەی مەبەستی(تەنها دنیابیْ)کەبەپەلەو بەخێرایی تێدەپەڕیْ، ئێمە هەرچیمان بویْ بەزوویی، بەویستی خۆمان، وەبەهەرکەس کەبمانەویْ دەبەخشین، پاشان ئەوکەسانە(واتە دنیاپەرستان)دەخەینە دۆزەخەوە، بەسەرزەنشت کراوی ڕاونراویەوە} {بەڵام ئەوەی مەبەستی بەشی ئەوجیهان بیْ وهەولْ وکۆششی چاکی بۆ بدات، لەهەمان کاتیشدائیمانداربێت،هەولْ وکۆششی ئەم جۆرە

کەسانە جێگەی ڕێزوسوپاسەوسوپاسکراون} {ئێمە هەردوولا(دنیاپەرستان وخواپەرستان) لەبەخششی پەروەردگارت بەهرەوەر دەکەین، بێگومان بەخششی پەروەردگارت سنوردارو قەدەغەکراو نیە(لەدونیادا)} {تەماشاکەو سەرنج بدە چۆن هەندێکیانمان بەسەر هەندێکی تریاندا ڕێزدار کردووە، بێگومان پلەو جیاوازیەکانی ئەو جیهان زۆر گەورەرو زۆر زیاترە}ت،ئا.

بزانە خوا هیچ دروستکراوێکی بێ هۆ دروست نەکردوە.

سەیرکە وسەرنج بدە لەماڵێك چەند کەس بەهۆی باوەڕو ئیمان و خواناسی کەسێك نان دەخۆن ودەژین، هەر وەك گوڵەکەی باسمان کرد کاتێك تۆ گوڵ ئاودەدەیت پێش گوڵەکە دڕکەکانی ئاو وەردەگرن، ئایا ئێمە دەتوانین گوڵەکە ئاو بدەین ، وە دڕکەکان ئاو نەدەین، ئێستا چەندەها کەس بەهۆی یەك ئیماندار خوا ڕزقیان دەدات لەناو خێزانێك، نەکەن بۆ تەنها ساتێکیش بیرو خەیاڵی ناشایستە بکەنەوە_ چونکە کاری خوداو ویستی عبد زۆر لێك دوورن.



## زۆربوون دەبێتە مایەی دڵە ڕاوکێ و سەرلێشێواوی

زۆربـوون لـەماڵ لەمنـداڵ لـەکار هـەمووی دەبێتـە هـۆی شـپرزەیی و نارحـەتی، هەرچـەند ماڵـت زۆربێـت خـەمت زیـاد دەکـات کـاتی خواپەرسـتی وپـشودان وسـەردان وسـەفەرت کـەم دەبێت، ئەوکاتـەش کەمنـداڵت زۆربێـت هـەروا خـەمت زیـاتر دەبێـت ( خـەڵکانێك دەڵێن منـداڵ مایـەی خۆشـی وشـادی وئیـسراحەتی تەمەنی پیریمە) بەڵام زۆر کات وانیە، چونکە ئەگەر تۆ لە باخچەو شوێنێکی پڕ لەدارو درەخـت بیت حەزبکـەی تۆزێك ماندویەتیت بسێنیتەوە ناتوانی کـەمێك لــەژێر دارێــك.کــەمێکی تــر لــەژێر ســێبەری دارێکــی تــر ماندویــەتیت بسێنیتەوە.لەگەڵ هاتن وچوون ماندوو تر دەبیت، تەنها لەژێر سێبەری یـەك دار دەسێیتەوە، منداڵیش بۆ تۆوایە ئەگەر تـەنها یـەکێك یـان دووانت هـەبێ مانـای وانیە تـۆ بـێ منـداڵ وبێ کەسی،گەورەترین دەسکەوت ئەوەیە منـداڵێکی بـاش پــەروەردە بکــەیت تــابتوانی ســودی لێببــینی ، لەگــەڵ پیربوونــت بێــزاری دەرنـەبڕێت، هەوڵبـدە بناغـەی پـەروەردەکردنی پتـەوبێت ڕەگـی خۆشەویـستی لەناخی دڵیدا دایکوتابێ. بەتۆزووبا، بەزریان، بەگەردەلول،ئـەم ڕەگە دەرنەیـەت لەناخی (مەبەست ئەوەیە بە نەخۆشبونت یان ناخۆشی وحادزی و هتد).هـەر تۆی بوێت .

هـەبوونی مـاڵ وسـامان تووشـی دڵـە ڕاوکـێ ونارەحـەتی وشـەونخونی وخـەمت دەکـات، هـەتا شـتەکانی چـواردەورمان زۆر بێـت نـاکۆکی و غڵغەڵـەو فکـرو خەیاڵیش زۆر دەبێت، لەبـەر ئـەوە تـابتوانین ئەرکـەکان قـورس نەکـەین بۆئـەوەی مورتـاحبین، ژیـان دەرفـەتی زۆری تێدانیــە دووبـارە بێتــەوە تەمــەنت بەخــەم وخەفـەت بەسـەر مەبـە (نـانی بـەیانیت هـەبێت خواکەریمـە بـۆ دوزیـەی)خـەم لـە ڕۆژەکانی داهاتوو مەخۆ، ئەوخوایەی ماسی ناودەریا وکرمی ژێرزەوی باڵندەی ئاسمان لـەبیرناکات، باشترین وخۆشەویسترین دروستکراوی خـۆی چۆن لـەبیر دەکات، هەردەم قەناعەت باشترین دەسمایەیە،

## گوێ پێ نەدان

هەموو گوێ پێ نەدانێك دەبێتە مایەی ناخۆشی وخراپە، مەڵێ منداڵەکەم هێشتا بچوکە چیەتی ئەگەر جلی کورت وتەسك وتەنکی لەبەر کرد ، مەڵێ دوایی بەخۆی کاتی گەورەبوو ڕاست وچەوت جیا دەکاتەوە،گووتویانە (خوی شیری تاکوپیری)،

کارێکی زۆر نارێك دەکرێت لەمانگی (ڕەمەزان)ئەوەیە ؟دایکان وباوکان بەڕۆژوون نان ناخۆن نیوەڕۆکەی ئەوە شتێکی ئاساییە، بەڵام ئەوەی نائاساییە منداڵەکان بێ بەش مەکەن لەنان خواردن بەبۆنەی کەوا ناتوانن شتێکیان بۆ ئامادە بکەن ئەوەش زیاتر دەگەڕێتەوە ئەستۆی دایك،بەکێك ونان وچا رازیان مەکەن. چونکە بەم کارەوادەکەیت منداڵەکەت هەر لەسەرەتای چاوکردنەوەی کەیفی بەم واجبە نەیەت ئەرکی بۆ قورس دەکەی ، من زۆرپرسیارم لەم کەسانە کردوە کەوا تەمەنیان لای داوە لە٣٠ساڵ ووتومە؟ بۆچی بەڕۆژوو نابیت ، لەوڵامدا گووتی کاتێ تەمەنم ٦_٧ساڵان بوو دایکم پارچە نانێکی دەدایە دەستم دەیگووت ئەوە بخۆ ئێوارە خواردن ئامادە دەکەم، یان کاتێ پرسیارێکم بکردایە لەباوکم زۆر بەتوڕەیی وەڵامی دەدامەوە زۆر جاریش هاوارى دەکرد دەیگووت (تۆ زۆر بێ ئەقلی نازانی بەڕۆژوم بۆ ماندوم دەکەی واز بینە بڕۆ)، ؟بۆچی خۆت برسی دەکەیت کاتێك خۆشەویست نەبێ لەلات تەنها وەك واجبێکی ئیجباری سەیری ڕۆژوەکە بکەی. کەنەتوانی بەرگەی پرسیارو وڵامێك بگری.ئەم جۆرە گوێ پێ نەدانە شکستی زۆری لێدەکەوێتەوە، هەڵەکان بچوکن کەچی بە ڕۆیشتنی ڕۆژگار گەورە دەبن ،لەتێکچوونی بنەماڵە دەردەچێت دەکەوێتە ناو کۆمەڵگا، ئەوانەی کەشبهی ڕووتن لەبازاڕەکان لەدائیرەکان لەشوێنەجیا جیاکان دەبینرین هەر ئەومنداڵانەن کەبچووك بوون پێش چەند ساڵێك وەنەیان دەزانی ئێستا گەورە بوونە ، بەڵام ڕەوشتی منداڵیان هەرماوە ونەگۆڕاوە.وەك دەڵێن خووی شیری تاکوو پیری.!

(کۆتایی باسەکانمان)
(ڕوون کردنەوەیەکە دەربارەی ڕۆژی دووایی)
ئەگەر خوای گەورە دەرفەت بدات لە
بەرگی دووەم
بەووردی باسی دەکەین (انشاء الله)

# ڕوون کردنەوەیەکە دەربارەی ڕۆژی دووایی

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

ٱقۡتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمۡ وَهُمۡ فِي غَفۡلَةٖ مُّعۡرِضُونَ ﴿١﴾ صدق الله العظيم {الانبيا}

**واتا: {موحاسەبەو لێپرسینەوەی خەڵکی نزیک بۆتەوە، هەرچەندە(زۆربەی)ئەوان بێئاگاوغافڵن وپشتیان کردۆتە(ئاینی خوا)وڕوویان وەرگێڕاوە(لە بەرنامەکەی)ت،ئا.**

**ئەو ڕۆژە نزیك بۆتەوە ئێمەش ئاگادارنین .تۆبەبکەن بگەڕێنەوە پێش ئەوەی ئەم کاتانەتان لەدەست بچێ سەیرێکی دەورووپشتی خۆت بکە،چەندەها خۆشەویستمان مرد، ناسیاو خزم هاوسێ و هاوڕێ ودۆست ودوژمن وناحەز، هەمویان دونیایان جێهێشت چوونەوە ناو زگی دایك کەئەویش ناخی زەویە،؟ئایا هیچیان لەگەڵ خۆیان برد ، لەوپارەیەی کە شەوڕۆژ بۆیان هەوڵ دەدا هیچیان برد،بینا بەرزەکەی. خانووە جوانەکەی. سەیارە ئاخیر مۆدێلەکەی هتد.. تەنها کارو کردەوەکانی نەبێت هیچیان لەم شوێنە بەکەڵکی نایێن**

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ﴿١﴾ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ﴿٢﴾

صدق الله العظيم {الحج}

واتا: {ئەی خەڵكینە لە پەروەردگارتان بترسن وخۆتان لەخشمی بپارێزن چونكە بەڕاستی لەرزەی قیامەت و(كاولبونی دنیا)كارەساتێكی زۆر گەورەیە وشتێكی(سامناكە)} {كارەساتی،ئەو ڕۆژە كە پێش دێت دەبینن، هەر ئافرەتێك(كەمندالی لەباوەشدایە لەكاتی)شیر پێدانیدا، لەترسا هۆشی لای خۆی نامێنیٚ وجگەرگۆشەكەی فەرامۆش دەكات و(لەباوەشی بەردەبێتەوە)هەرچی مێینەیەكی بار دار هەیە، منداڵ وبەچكەكەی لەبار دەچێت، خەڵكی دەبینی، دەڵێی سەرخۆشن، بەلاٚم سەرخۆشیش نین، بەلٚكو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناكە و(سەری لێشیواندوون)}ت،ئا.

ئەوكات هیچ تۆبەیەك گیرانابیٚ . دلٚتان بەدونیا خۆش مەكەن سەیری گۆڕانكاریەكان بكەن ڕۆژانە ڕوو دەدات ، هەموو كەس لەناو دەچیٚ هەمووكەس دەمرێت .پاشا ومەلیك و كاربەدەست و فەقیر وهتد .. لەدوای یەك هاتن و ڕۆیشتن. باش بزانە تۆش جێی دەهێڵی ڕۆژێك، كەسێك نیە نەمر بێت (تەنها خوای گەورە ماوە وهەر دەمێنیٚ)؟ چەند پرسیارێك دەخەینە ڕوو (بابەتی دووەم كەباسمان كرد ووتمان بۆچی گەڕاینەوە سەردەمی نەزانی؟ ئێستا خەڵكانێك هەن ڕەفتاریان وەك سەردەمی نەزانی وسەرهەڵدانی ئیمان وباوەڕ وایە. باوەڕپێنەكردنی قورەیشیەكان بە(پێغەمبەر)ﷺ لەبەر ئەوەی پێیان ناخۆش بوو یەكێك لەخۆیان ڕێنموییان بكات ڕێگایی چاك وخراپیان پیٚ نیشان بدات. دوای ئەم هەموو ماندوو بونە ئەم هەولٚ وتێكۆشان وهەوڵدانە و جیهادە لەپێناو باوەڕەكەی ونامەكەی تاكوبەئێمەی بگەیەنی . ئێمەش ئێستا ماندووبونەكەی خۆشەویستمان و هاوەلاٚنیمان فەرامۆش كردوە . ڕووتی وبێشەرمی . ئازاردانی دۆست وهاوسیٚ. خۆش ویستنی ماڵ وسامان. نەمانی ڕێز وگەورەیی، نەمانی بەزەیی ولێبوردەیی ،لەیادمە لەساڵەكانی ١٩٩٠هاوسێكمان (مرد)لەماڵەوەمان زیاتر لەدوومانگ تەلەفزیۆنمان هەڵگرتەوە نەوەك لەبەر دەست بیٚ منداڵ بچیٚ پیٚ بكات بیٚ

ئاگاداری دایك وباوکی دەنگی بڕوات خاوەن مردوو پێی بزانی خەم بخوات، ئەوکات مردو سامووو هەیبەتی هەبوو خەڵك لەمردن دەترسا دەیگروت ئەمڕۆ ئەومرد بەیانی منم، پرسەی هاوسێی وەك پرسەی خۆی بوو، بەلاّم ئەمڕۆ یەکێك بمرێ دووای دووڕۆژ تەلەفزیۆن پێکراوە لەماڵەکەی خۆی لەلایەن ماڵ ومنداڵی ، خەڵك زۆر بێ بەزەیی بووە هەر ووتومە دەیڵێمەوە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ کەم ئیمانی ! بۆ وامان لێهات ئایا کەی ئەومیللەتە لەخەوی غەفلەت بەئاگادێ دەزانی خوا حەقە، مردن حەقە، ژیانی دووای مردن حەقە وڕاستە؟ (ئیمام ترمزی لە پێغەمبەرەوە ﷺ،بۆمان دەگێڕێتەوە. دەفەرموێ {دونیا نەفرەتیە، ئەوەی تیاشیدایە نەفرەتە، تەنها یادی خوانەبێ}،هیچ بەندەیەك وگیان لەبەرێك نیە نەمرێت،

(بسم الله الرحمن الرحيم)

كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ﴿٥٧﴾ صدق الله العظيم {العنكبوت}

واتا{هەموو کەس دەبێ مردن بچێژێ(کەی،لەکوێ،بەچی،خوانەبێ کەس نایزانی)لەوەودوا گەڕانەوەتان بۆ لای ئێمەیە}ت،ئا.

وەهەرکەسێك لەسەرچ کاروو کردەوەیەك بمرێت لەسەر ئەویش زیندوو دەکرێتەوە ، بۆیە ئاگاداربن چونکە مردن کاتی دیاری کراوی نیە تاخۆمانی بۆ ئامادە بکەین بۆیە لە ئێستاوە وادابنێین کە ئەوڕۆژەی ئێستا لەدەستمانە و تیایدا دەژیین دوایین دەرفەتە ودوایین ڕۆژە، دڵتان پاك وبێگەرد وخاوێن بکەن، کردەوەتان ڕێك وجوان بکەن،تادەرفەت ماوە ، چی وەلاّمی پەروەردگارت دەدەیتەوە کاتێك لەبەر دەستی ئەو وەستای(ئەوکات خوای گەورە ڕاستیەکان دەزانێ هەرچەند تۆ بتەوێت بیان شاریتەوە)

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

ٱلْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَىٰٓ أَفْوَٰهِهِمْ وَتُكَلِّمُنَآ أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٦٥﴾ صدق الله العظيم {ياسين}

واتـا: {ئـەمڕۆ مـۆر دەنـێین بەدەمیانـدا و(قسەیان بـۆ ناکرێـت)بەڵکو دەسـتیان قسەمان بۆدەکات(دەربارەی ئەو تاوانـەی کـە ئەنجامیان داوە)قاچیان شـایەتی دەدات(کەبۆکوێ هاتوچۆیان پێکردوە)چ کاروو کردەوەیەکیان پێ ئەنجام داوە} هــەروەك شــریتی ڤیــدیۆو ســی دی ودیــسك قــسەمان بۆدەکــەن بــاوەڕبوون بەقسەکردنی دەست وقاچ ئاسانە،}(ت،ئاسان) ئایا سـەیرە ئەگـەر ئەندامـەکانی لـەش بێتــە گووفتــار وقــسەکردن، دروســت کــراوی خــوا زۆرن ، زۆریــشیان بەچاونابیندرێن کەچی گیانیان لەبەرەو دەژین ودەخۆن ، ئەوان سەیر نین بـەڵام سەیرە ئەندامـەکان بدوێن! ئەنەسـی کـوڕی مالیـك ڕ.خ، دەڵـێ :ئێمـە لەخزمـەت پێغەمبــەر ﷺ ، دانیـشتبووین(پێکــەنی فــەرمووی) دەزانـن بەچـی پێکــەنیم، وتمان: خـواو پێغەمبەرەکەی زاناترن، فەرمووی (لـە وتووێژیی بەنـدە لەخزمـەت پەروەردگاریـدا ، دەڵێـت: ئـەی پـەروەردگار تـۆ منـت پـەنا نـەداوە لەسـتەم؟ دەفـەرموی بـەڵێ، دەڵێـت:مـن ڕێگـا نـادەم بەشـایەت بەسـەرمەوە مەگـەر لـەخۆم بێـت، دەفـەرموی: ئـەمڕۆخۆت بەسـی بەسـەر خۆتـەوە،هاوڕێ لەگـەڵ فریـشتە بـەڕێزە نوسـەرەکان،ئیتر مـۆر دەنرێـت بەسـەر دەمیـدا، ئینجـا بـە ئەندامـەکانی دەوترێت بێنە گوفتار: هەموو دێنە گۆ بەو کردەوانەی کـە کردویـەتی : پاشان ڕێـی دەدەن کەقسە بکـات، دەڵـێ:ئـاخ لـەئێوە تـەریك بن وبچن خـۆمن بـۆ ئێـوە تێدەکۆشام،) ئاگاداربن بۆژیانێکی کاتی ، ژیانی نەبڕاوەو بەردەوام نەفەوتێنن، بڕوابکەن چاوتروکانە ئەوەی بەدووری دەزانی ، ئاگاداربە ئازیزم!

## چەند ووتەیەکی بەنرخ

_ کاتەکان گرنگن بەفیڕۆیان نەدەن.
_ ئەوەی دەرگای ڕەحمەتی بۆکردوینەوە ،دەتوانی زۆر بەئاسانی دایبخات.
_ داخوازمەبـە ئـەوڕۆژەی تیایـدای زوو بـڕوا وتـەواوبیّ، چـونکەڕۆژێك لەتەمەنت تەواو دەبێت ڕۆژێك لە مردن نزیك دەبیتەوە.
_ شـەرم ناکـەی لـەدەرگای ئـەو و ئـەو دەدەی داوا دەکـەی، بـەلاّم لـەدەرگای خودا نادەی داوا لەئەو بکەی، کەوا هیچ کات بەڕووت دانـاداتەوە.
_ خوایە؟ ئێمە زۆر پێویستمان بەیارمەتی تۆیە ، بەلاّم شەیتان فریوی داوین ناتوانین لەبەر شەرمەزاریمان دەست هەلّبڕین وداوات لێبکەین.
_ کێیە لەدەروونی خۆت، لەخۆت.نزیکتر؟ کێیـە ئـەوەی نهێنی پارێزبیّ بۆت زیاتر لەخۆت؟ تەنها خوای گەورەیە.کەهیچ شت نیە لەو شاراوە بێت.
_ کەس هەیە لەخوا بەبەزەییتربێت بۆئادەمیزاد،ئەوکاتـەی یـەکی کـوفر بکـات دەتوانی گیـانی لێبستێنی.(ولاکن یؤخیرهم الی اجـلً مـسمیً). بەلاّم دوايـان دەخـات بۆكاتێكي دياري كراو.
_ ئەگەر رزق وڕۆزی دیار بوایە ، لەسەداپەنجا خەلّك لەبرسان دەمردن.
_ ڕزق لەدەست بەندەبوایە ، براکەی لەبرسان دەمرد.
_ نوستن پێویستە بەلاّم بەگوێرەی پێویست نەوەك ڕۆژی ١٢کاتژمێر لەژیانت بەخەوتن بڕوات،واتا نیوەی ژیانت بەفیڕۆ چوو؟ ئاگەڕێتەوە ئاگاداربە.
_ ژیانی ئادەمیزاد خۆشە ،خۆشتردەبێت لەگەلّ خواناسینی پتەو وجێگیر.
_ مـەگری وخـەم مـەخۆ بۆنـەبونی مـالّ وسـامان ، بـەلّکو زۆر بگریـی بـۆ کـەم بوونی باوەڕوئیمان.
_ گرنگی ژیانت لە تاقیکردنەوەکانی دایە.
_ هەموکات یادی خوابکە(الابذکر الله تطمئنُ قلوب)دلّ ئارام دەکاتەوە.
_ خۆشی وشادی ژیان لە بیرێکی ساف و دلّێکی بێگەرد دایە.
_ ئەوەی هـی منـە کـە لـەژێر دەسـتم ولـەگیرفانم دایـە، نـەوەك ئـەوەی بـەیانی بەنیازم بەدەستی بێنم .
_ دلّ مەدە بەکەسێك وبەشتێك وەك مالّی دونیا لەنزم بوون وبەرزی دابێت.

_ پشت ببەستە بەکەسێك کە هەردەم وهەموو کات خاوەن قسەی خۆی بێت.
_ ژیانی دنیا دەرس وعیبرەتە، لەش ساغی هەردەم مالْ وسەروەتە.
_ ئەوەی بەردەوامە باشترە لەوەی ڕوو لەنەمانە(ئاخیرەت بەرامبەر ژیانی دنیا).
_ مەگری بۆنەبوون، مەنازە بەهەبوون، هیچیان تاسەر نین هەبوون ونەبوون.
_ هەمو کەسی خاوەن دلْی گەورە نیە. تەنها ئەوکەسانەی دلْیان ڕووناکە بەئیمان.
_ خۆشە بەرامبەر کەموو کوڕیەکانت ، بیسەر بیت نەوەك شەڕکەر.
_ قسەی شیرین دلْی دوژمن دەکاتە هەنگوین.
_ قسەی توندو تالْ دۆستت بۆدەکاتە دوژمنی حەودالْ.
_ شەقامەکانی ولاْتەکەم، باشترە لە کۆشکی بێگانەکەم.
_ دەرگای مالْت زوو دابخە کاتی ڕۆژئاوا، زوو بیکەرەوە کاتیْ ڕۆژ درەوشاوە.
_ دلْ گەورەیی سیمایی ئادەمیزادی زاناو تێگەیشتوە،
_ جارێك سەردانی کەسێکت کردووە لەنەخۆشخانە ،ئەوکات هەستت کردووە تەندروستی نیعمەتی ژیانە،.
_ دووژمنانت دلْ خۆش مەکە بە ناڕحەتیت و توڕەییت.
_ لەدانیشتن و کۆڕو کۆبونەوە تادەتوانی تەنها بیسەر بە ئەوکات خۆشەویستی.
_ ئیمانداری تەواو هیچ کات لەبەسەرچوونی کات وتەمەن دلْ تەنگ نابیْ.
_ دلْخۆشبوون بەمالْ سامان دونیاییە، دلْخۆشبوون بەزانست وزانیاری بێکۆتاییە.
_ هاوڕێی باش دلْ ئارام دەکاتەوە خەمەکانیش کەم دەکاتەوە.
_ هیچ کەس بیْ عەیب نیە، عەیبی یەکتر بەچاوی یەکتر دامەدەنەوە لەکاتی توڕەبووندا،وامەزانن جارێکی تر ئاشت نابنەوە.
_ عەیبی خۆت چارەسەر بکە بەدوای عەیبی خەلْك مەگەڕیْ.
_ ئەوەی خۆشی دونیایە لەقورئان خوێندن دایە، خوی پیْ بگرەوبەری مەدە دلْ نەواییە وخەلاْتی دواڕۆژیشی لایە.

_ لەوە خۆشتر نیە تەنها بەندەی خودا بیت، بەهەموو ڕووداو وبەسەر هات ڕازیی دەبیت، بەلاّم ئەگەر خۆت بە بەندەی خودا دانەنێیت ، بەهیچ شتی ڕازی نابیت و ئەوکات بەندەی هەموو خەڵك وهەموو شتێکی.
_ گەورەترین خەمت با ڕۆژیی دوایی بێت.
_ خۆشترین ڕۆژت ئەو ڕۆژەبێت کە لەبەر گەورەیی وترسی خودا دوو دڵۆپ فرمێسکت ڕشتبیٚ .
_ ئایا چەند قامچیت لێدراوە وازت لەدینەکەت هێناوە، ئایا تاچەندی شەو لەغەزاو شەڕی کوفار نەگەڕایتەوە بەیانی درەنگ خەبەرت بویەوە نوێژی بەیانیت لەکیس چوو.
_ (الا ان سلعة اللة غاليه . الا ان سلعة اللة الجنة)کالاو شتومەکی خودا گرانە ، بەهەشتە ئەویش تەنها ئیمانداری بەحەق دەتوانی بەدەستی بێنیٚ.
_ ئادەمیزادی زیرەك لەشکستی ونەهامەت درس وعیبرەت وەردەگرێت.
_ بزانە لەسەر کام پایە وەستاوی بۆئەوەی بتوانی زیاتر سەرکەوی نەوەك بگەڕێتەوە دوواوە ولەناکاو بەربیتەوە.
_ ئەگەر هەست بە لێهاتوویی خۆت نەکەی ،چۆن چاوەڕوانی ئەوە دەبی خەڵك بە لێهاتوو هەڵت سەنگێنن.
_ با باشترین هاوڕێت پەرتووك(کیتاب) بێت. زۆر بێدەنگە و زۆریشت فێر دەکات.
_ ئادەمیزاد جوانترین وگەورەترین و زاناترین بونەوەرە کەوا خوای گەورە دروستی کردووە.
_ شەو سەرەتای ڕۆژە، ڕۆژیش سەرەتای شەوە .
_ ئاوا بژیی کە ئەوکاتەی تیایدا دەژیی دوایین دەرفەتتە بۆژیان، ئینجا هەست دەکەی هەردەم دڵخۆشی.
_ خوای گەورە دەرگەیەك دابخات ، چەندەها دەرگەی تر دەکاتەوە.
_ خوایە ئەوەی بیری بەهێزت پێی داوە چیت لیٚ گرتۆتەوە، ئەوەی بیریشت نەداوەتیٚ چیت لەجیاتی داوەتیٚ(علی ابن ابی تالیب.ڕەزای خوای لەسەر) .
_ هەڵە دووبارە مەکەوە دوایی دەبێتە خوو ناتوانی وازی لێبهێنی.

_ ئەگەرسەیری ئاوێنە بکەی تەنها خۆت لێدیارە.
_ پێکەنینی بەبێ سەبەب ، مرۆڤ دوور دەخاتەوە لەئەدەب.
_ گریان لەبەر شەرمی خودا،دڵ دەخاتە خۆشی وصەفا،
_ گریان بۆ دونیا دڵ ئازار دەدا لەخۆشی دواڕۆژ بێ بەشت دەکا.
_ کارێك بە ڕەزامەندی خۆت بیکەی ، ئەنجامی خراپەکەی مەخەرە ملی ئەوەی یارمەتی دای بۆئەنجام دانی.
_ لەلای نەفام و نەزان پارە پاشای سەردەمە.
_ پێغەمبەرمان ﷺ لەیەکەم ڕۆژی ویلادەتی تادواپین هەناسەی خەمی ئێمەی بوو بەردەوام لەخوای گەورە داوای لێخۆشبونی کردووە و وتویەتی(ئومەتی.ئومەتی) کەچی ئێمە بەزەییمان بەخۆمان نایەتەوە خۆمان ناپارێزین لەگوناە وتاوان و(دۆزەخ)بۆ؟.
_ ئەی پێغەمبەری خۆشەویستمان دوای تۆ ئومەتت زۆر غەریب بووە .
_ پێغەمبەر ﷺ لەسەر بێ فەرمویەتی ( ماڵەکانتان مەکەن بە گۆرستان، یادی خوا زۆر بکەن).
_ ئەوەی لەسەر ڕێبازی ئیمان وباوەڕی ڕاست لای داوە هەردەم کەوتۆتە دواوە ، ئەگەر لەم دونیایەش نەبێ بۆ ئاخیری بۆی هەڵگیراوە.
_ نارەحەتی دڵ ودەروون بەخۆی تاوان وگوناهە، تەنها بە تۆبە و استغفاری زۆر ئینجا ئارام دەبێت.
_ ئاگاداربە خۆشەویستی مەدە بەدونیا وژیان یان شتێك یان کەسێك، شەرمەزاریە چونکە بەرەو نەمانە،تەنها خۆشەویستی خودا و(محمد) ص ،وقورئانە تاکوو قیامەت کۆتایی نیە وبەردەوامە.
_ کەس لەبێدەنگی پەشیمان نەبۆتەوە، بەڵام زۆرن ئەوانەی لە زۆربلێی پەشیمان دەبنەوە.
_ ئەگەر بەگەنجی کات وون بکەی، دلنیابە بەپیری پشتت لێ دەکات.
_ چاکە کردن هەمووکات نارەخسێ ئادەمیزاد بیکات، ئەوکاتەی چاکەکردنت بۆ هاتە پێش بیکە درێخی مەکە لەئەنجام دانی نەوەك دووبارە نەبێتەوە.
_ هەموو کات دابەزین ئاسانترە لەسەرکەوتن.

_ ئەوکەسانەی پێش مردن نەفرەت دەکرێن زۆرن، دوای مردن بۆیان دەگرێین.
_ ئەوکارانەی ئەمڕۆ پەلەتە لەئەنجامدانی ، کاری دوێنی یە ماوەتەوە.
_ تا دەتوانی خۆت لەخەوتن بپارێزە ، چونکە دوای مردن کاتی زۆر هەیە بۆحەسانەوەو نوستن.
_ دەزانی کیە مرۆڤی دانا ئەوەی بەخۆی نەڵێ زانا.
_ دەزانی کیە مرۆڤی دڵخۆش؟ ئەوەی بەهەبوون نەبێت بێهۆش، بەنەبوونیش قەت نەبێ پەرۆش

بەهیوام سود بەخش بووبن ،انشاالله،
داوای پاڕانەوەی بەخێر لەئێوەی ئازیز دەکەم بۆ ئەوەی بتوانم بەرگی دووە بەزووترین کات بخەمە بەردەستی ئێوەی بەڕێز

(نووسەر)

پەرتووکەکەم پێشکەش دەکەم بەهەموو ئازیزانم بەهەموو دڵسۆزان وخۆشەویستام
بەتایبەتی باوکی خوالێخۆش بووم (خوای گەورە بەبەهەشتی بەرینی شاد بکات، انشاء الله)

# ناوەڕۆک



{إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَآءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ}

بەڕاستی تۆناتوانی هیدایەتی ئەوکەسانەبدەیت کەخۆشت دەوێن بەڵکو هەر خوا هیدایەتی
ئەوانە دەدات کەدەیەوێت . ئەو زاتە زۆر دانایە بەوانەی کەرێبازی هیدایەتیان گرتۆتەدەست